نووسینی

دوکتۆر عەلی شەریعەتی

وەرگێڕ: صدیق بۆرەکەیی «صفی‌زادە»

# گەڕانەوە سەرخۆ



گەڕانەوە سەرخۆ ـ نووسراوی دوکتۆر عەلی شەریعەتی ـ صدێق بۆرەکەیی وەری‌گێڕاوەتە سەر زمانی کۆردی و پێشەکی و چۆنیەتی ژیانی شەریعەتی و فەرهەنگی بۆی نووسیوە.

# گەڕانەوە سەرخۆ

## دوکتۆر عەلی شەریعەتی

وەرگێڕ: صدێق بۆرەکەیی «صفی‌زادە»


سروش

تهران، ۱۳۵۹

# پێشەکی

ئەم نامیلکە پاچقە و تەرجەمەی دەفتەری یەکەمی قسەکان و وت ویژەکانی دوکتۆر عەلی شەریعەتی‌یە ،کە لە زانستگەی گوندی شاپوورا درکاندوویە. دوکتۆر عەلی شەریعەتی بە هۆی زەبر و زەنگی رژێمی ستەمکاری پادشایەتی‌یەوە نەی ئەوێرا کە نووسراوەکانی خۆی بە تەواوی چاپ کا، ناچار بوو کە نوسراوەکانی پارچە پارچە و پچڕپچڕلە ناوی خەڵکا بلاوکاتەوە.

ئێمەش دەفتەری یەکەمی ئەم نووسراوە کە ناوی «گەڕانەوە سەرخۆ» یە، وەرمان گێڕایە سەر زمانی کوردی، جا مامۆستا هەزار گوتەنی تۆش جوان وردی بەوە ووردی کەوە، ئەگەر سوود و کەڵکی پی‌گەیاندی و شتی باشی تی‌گەیاندی ماڵی نووسەرەکەی ئاوا، ئەگینا وازی لی بێنە و کەسمان لە کەس.

تاران ١٣٥٩ - بۆرەکەیی

# دوکتۆر شەریعەتی کێیە؟

دوکتۆر عەلی شەریعەتی یەکێ لە ئەستێرە هەرە گەشەکانی ئاسمانی وێژە و فەرهەنگ و زانستی نیشتمانە خۆشەویستەکەمان (ئێران)ە. وە هەتا هەتایە ئەدرەوشێتەوە و ئاوا بوونی بۆنیە. ئەم مامۆستا گەورە وئەمتێکۆشەرە کوڵ نەدەرە بە ناوبانگە، کە ژیانی خۆی کردە قوربانی گەل و نیشتمانەکەی لە ساڵی ۱۳۱۲ ی هەتاوی لە شاری مەشهەد دا پێی ناوەتە مەیدانیژیانەوە، وەهەر لەو شارەدا باوکی ناویەتە قوتابخانە و خەریکی خوێندن بووە و پاش تەواو کردنی دەورەی سەرەتایی و ناوەندی لە ساڵی ۱۳۲۹ داروێشتووەتە زانکۆی سەرەتایی مەشهەد، وە لە ساڵی ۱۳۳۱ لە دێی ئەحمەد ئاوای مەشهەد دا بووەتە مامۆستا. پاشان دەستی لە مامۆستایی کێشاوە و لە ساڵی ۱۳۳۵ دا روێشتووەتە زانکۆی وێژەی مەشهەد، وە لەو ساڵەدا گەلێ وتاری لە بارەی ئایینی پیرۆزی ئیسلامەوە بۆ رۆژنامەیخوراسان و گۆڤاری فەرهەرفگ نووسیوە.

هەر لەم سالانەدا کاربەدەستانی خوێن مژی ساواك ئەو و باوکیان گرت و لە بەندیخانەی قزڵ قەلادا بەندیان کردن. دوکتۆر لە بەندیشدا بێکار دانەنیشت و پەڕاوی «نیایش» یا پاڕانەوەی وەرگێڕایە سەر زمانی فارسی. لە پاش ماوەیێ لە بەند ئازاد ئەبێ ولە ساڵی ۱۳۳۸ دالیسانس لە زانکوێ مەشهەدا وەرئە گرێت و ئەڕواتە فەرانسە ولە زانکۆی فەرانسەشدا خەریکی خوێندنی رشتەی مێژوو و کۆمەڵ ناسی ئەبێ و دوکتۆرا وەرئەگرێ.

لە ساڵی ۱۹۵۹ ی زاین دائەڕواتە ئەلجەزایر و ئەبێتە ئەندامی سازمانی

ئازادیبەخشی ئەلجەزایر و ماوەیی لەوێدا ئەمێنێتەوە. لە سالّی ١٩٦٠ دا زنجیرە وتارێ بۆ وریایی خـوێندکارە ئێرانی‌یەکان بە ناوی پالێ بە کێوە بدەین «بە کجـا تکیە کنیم» لە ڕۆژنامەکان دا بلاّو ئەکاتەوە. لە سـالّی ١٩٦١ دا بە هۆی بەشـدار بوونی لە سازمانی ئازادیبەخشی ئەلجەزایر ئەیگرن و ئەیخەنەبەندیخـانەی پاریس. لە سالّی ١٣٤٣ دا کەلّکەلّەی گەڕانەوەی نیشتمان ئەکەوێتە سەری و ئەگەڕێتەوە ئێران، بەلّام هەرکە پیٚی ئەنێتە سەر خاکی ئێران، ئەیگرن و ئەیبەنە بەندیخانەی قزل‌قەلّا و لە وێدا ماوەی سالّێ بەندی ئەکەن.

لە سالّی ١٣٤٤ دا کە لە بەند ئازاد ئەبیٚ، لە یەکێ لە دێکانا ئـەبێتە مامۆسـتا و پاشان ئەچێتە زانستگای مەشهەد و ئەبێتە مامۆستایاری زانکـۆی ویژە و زانسـتی ئیسلامی. لە سالانی ٤٦ تا ٥٢ لە «حـوسەینیەی ئیرشـاد» ی تاران خـەریکـی ڕێنموونی و هان‌دانی خـەلّك بۆ بزووتنەوە و ڕاپەڕینێکـی سـەراسـەری لە ئێران‌دا ئـەبیٚ و گەلیٚ وتار و نووسـراوی بەنرخ و بایی‌دار دائـەنیٚ. لە سـالّی ٥٢ دا «حوسەینیەی ئیرشاد» ئەبەستن و دوکتۆریش بۆی دەرئەچـیٚ و لە جـیٚی ئـەودا باوکی ئەگرن. پاش یەکسالّی‌تر خـۆی بە کاربەدەسـتانی خـوێنمژی پاشـایەتی ئەناسێنیٚ و دیسانەوە ئـەیخـەنە بەندیخـانە و هەژدەمانگ لە بەندا ئـەمێنێتەوە. لە پاش ڕزگار بوونی لە بەندیخـانە، ئـەڕواتەوە ئـورووپا و لەویٚ دا ئـەمێنێتەوە و هەر لەوێش کۆچی دوایی ئەکا.

لە بارەی چـۆنیەتی مەرگ و کوژرانی دوکتۆر عەلی شـەریعـەتی‌یەوە، لێکـۆلّینەوەیی بە هۆی نووسـەرانی ڕۆژنامەی کەیهـانەوە کراوە کە کورتەی ئـەو لێکۆلّینەوە ئەمەیە: «دوکتۆر عەلی شەریعەتی کە سالّها ژیانی لە بارەی لێکۆلّینەوە و بووژاندنەوەی ئـایینی پیرۆزی ئیسـلام و بەربەرەکانیٚ لە گەلّ ڕژێمی خـوێنمژ و ستەمکاری پادشایەتی دا بەسـەر برد بوو، پاش ئـەوەی چـەند جـار بەند کرا، سەرئـەنجـام لە مالّەکەی خـۆیا زیندانیان کرد، وە هەموو کاروبارێکـی دوکتۆریان خستە ژێر چاودێری‌یەوە. دوکتۆر ئەیوت گەرچـی منیان لە زیندانا ئـەشکـەنجـە نەداوە بەلاّم لە ئەشکەنجەدان پتر لە ئازاردا بووم، چونکە لە زیندانا لە پشـتی ئـەو بەندەی کە تێدا بووم نالّە و هاواری ئـەولاوە تیٚکۆشـەر و ئـازادی خـوازانە مە ئەبیست کە هەموو دەم ئازار و ئەشکەنجەیانیان ئەدان.

پاشـان کاربەسـتانی خـوێنخۆری سـاواك پیلانی‌تریان بۆ دوکتۆر گێررا، وە ئـەوەش ئـەمەیە کە کاتیێ دوکتۆر لە سـاڵی ١٣٥٦ دالەگەڵ منالەکانیا رۆیشـتە ئوروپا، نەیانهێشـت دوکتۆر لەگەڵ خێزانەکەیا ماڵ‌ئـاوایی بکـا، وە خێزانەکەی لای باوك و خـزمەکانیا مایەوە. پاشـان کە دوکتۆر گەیشـتە لەندەن، هەر ئـەو خـوێنمژانە ماوڵیان نەدا کە ماوەیێ پشـوو بدا، وە خێرا دوکتۆریان کوشـت.
سوسەنی شـەریعـەتی یەکێ لە کچـانی دوکتۆر، لە بارەی مەرگی بابیەوە ئـەڵێ: کاتژمێری یازدەی شەو بوو کە باوکم داوای ئیستکانێ چای لێمکـرد، دوای چـای خواردنەوە خەریکی خوێندنەوەی پەڕاو و گوڤارەکان بوو و پاشـان خـەوت. بەیانی کە چوومە هۆدەکەی روانیم کە بابمیان کوشتووە.
دوکتۆر عەلی شەریعەتی یەکێ لە نووسەران و ئیسلام ناسان و کۆمەڵ ناسانی ئازادیخوازی بەناوبانگی ئێران دێتە ئـەژمار. ناوی ئـەو هەتاهەتایە لە دڵی هەموو ئێرانێیکی ئازادی خواز و نیشتمان پەروەرا، ئەمێنێتەوە و لە بیر ناچێتەوە. ئـەو پتر لە پەنجا پەڕتووکی بەنرخ و بە کەڵکی وەرگێڕاوەتە سـەر زمانی فـارسی، وە گەلێ وتار و پەڕاویشی لە بارەی ئیسـلام و ئیسـلام ناسـی‌یەوە لێ بەجـێ ماوە. ناوی هەندێ لەو پەڕاوانە بریتین لە: «اسـلام‌شـناسی ـ تاریخ شـناخت ادیان ـ مذهب علیه مذهب ـ حج ـ انسان و اسـلام ـ شـهادت ـ ابوذر ـ خـودسازی انقـلابی ـ بازگشت به خویشتن ـ و....».

# به ناوی خوای مەزن

خەڵکی ئێمە وەکوو خەڵکی تر، وە زەمانی ئێمە وەکوو هەر زە مانێکی تر قاڵبڕێژ بووە،وە بیر و ئەندێشە و بڕواشیان بۆدانراوە. تیپەکان دیاری کراوە، وە ئەم تیپانە ڕێ و رەوشتێکی تایبەتیان هەیە. ئایینی، ڕۆشنبیر، خوێندەوار، نەخوێندەوار، کۆنە پەرست، دواکەوتوو، وە سەرکەوتوو کە هەر کام قاڵبێکی تایبەت و پەیوەندێکی دیار و زمانێکی پاراویان هەیە، وە هەر کام لەم تیپانە لە قسەی یەکتر تێ ئەگەن. هەر کەسێ لەم چەرخەدا بیەوێ پیاوێکی پیرۆز و سەرکەوتوو بێ و لە ناو گەل و کۆمەڵدا ڕێورچەی پەسەند بکرێ، ئەبێ بیروڕای خۆی بە خەڵك ڕاگەیێنێ، وە ئەو شتەی لە دڵیایە هەڵیرێژێ تا خەڵك لە بارەی بیروڕاکەیەوە بیر کەنەوە، وە ئەگەر بیرەکەی بیرێکی مرۆڤایەتی بوو ئەوا لە لایەن هەموو کە سێکەوە کە لە شوێنی ئەو بیرەدان پەسەند ئەکرێ.

هەر وەها نووسەرانی سەرکەوتوو و پێشڕەوی ئیمڕۆ لە بارەی هونەرمەندان و نووسەرانەوە ئەڵێن کە هەر نووسەر یا هونەرمەندێك ئەبێ پایەی بیروڕای خۆی دەربڕێ، ئەمە قسەیێکی دورستە، هەر کەسێ ئەبێ ڕێگەی کۆمەڵایە تیخۆی دەرخا کە چ گرۆیێکە و پەیوەندی بە چ ڕێورچەیێکەوە هەیە تا لە ناو خەڵکا بۆ خۆی لایەنگرانێ پەیداکا.

هەر هونەرێ، هەر نووسەری، هەر، روشنبیرێ کە ڕێگای خۆی روون کا و بڵێ: من ئایینیم یا ڕۆشنبیر یا پەیڕەوی فلاّن و فیسار ئیدئولۆژیم یا پەیوەندم بە فیسار دەستە و گرۆوە هەیە، خەڵك لە قسەکانی ئەو تێئەگەیێ و لە ئاکام دا

لایەنگرانی ئەو بیری خۆیان بە ئاشکرایی دەرئەبڕن. بەڵام هەندێ کەس هەیە کە بە هیچ رچە و دەستە و گرۆیێکەوە پەیوەندی نیە، وە ئەگەر هەموو دەستە و گرۆکان روو بکەنە ئایین پتر لە هەموو دەستە و گرۆیێکیتر پەیڕەو پەیدا ئەکەن، وە هەر گرۆیێکی ئایینی ئەگەر ئیدئۆلۆژیکی ئیسلامی هەبێ زیاتر پەرە ئەستێنێ چونکە ئایینی ئیسلام ئایینێکی راستەقینەیە، وە بە پیێی ئایینی ئیسلام هیچ تۆفیرێك لە نێوانی رەگەزەکان و زمانەکانا نابینرێ، وە ئایینی ئیسلام هەمووی مرۆ لە هەر رەگەز و نەژادێکەوە بن بە هاوچەشن ئەزانێ.

بەلام ئەوانەی کە کەوتوونەتە شوێن ئەو دەستانەی کە پەیڕەوی لە ئایینی ئیسلامەوە ناکەن بیریان لە گەڵ ئەوانەی کە لە ئایینی ئیسلامەوە پەیڕەوی ئەکەن یەك ناگرێ، وە ئەگەر لە ناو دەستەی رۆشنبیرا قسە بکەن یا مەبەستێك بدرکێنن، قسەکانی ئەوان بەرپەرچ ئەدەنەوە و تاوانباریان ئەکەن.

ئەم جۆرە کەسانە کە خۆیان لە خەڵك و ئیسلام نەبان و بێگانە ئەکەن، هەمیشە لە خەڵك گۆشەگیری ئەکەن، وە لە ناو خەڵکا بێگانە ئەبن و هەر وا ئەمێننەوە چونکە رێوڕەوشتێکی ئاشکرا و باشیان نیە، وە ئەم چەشنە کەسانە هەموو دەم نائومێدن و بە نائومێدیيەوە ژیان ئەبەنە سەر. ئەمانە کاتێ بە هەموو دەستەکانی جۆربەجۆر ئەڕوانن، ئەبینن کە ناتوانن ببنە هاوبیری دەستە و گرۆکانیتر، وە ئەگەر بیروبڕوای خەڵك ببیسن ناتوانن لە بیروڕایان سەردەرکەن و تێگەیێن، وە هەر وەها ئەم دەستە کاتێ بە ئایین ئەڕوانن ناتوانن بڕوای پێ پەیدا کەن و لە سەر ئەو رێوڕچە بڕۆن.

ئەم جۆرە کەسانە لە بەر ئەوەی بڕوایان بە ئایین نیە کاتێ سەرنجی کۆمەڵ ئەدەن لایان وایە کە دەستە و گرۆیێ لە ماوەی چەند سەدەدا بوونەتە هۆی سەرەوژێر بوون و دواکەوتنی خەڵك، وە ئەم دواکەوتنە لە گەڵ بیر و رێوڕەوشتی ئەوان دا بە توندی پەیوەند دراوە، وە وایانە بۆ دەرکەوتووە کە ئەبێ چەند سەدە تێپەڕێ تا ئەو بیر و ئەندێشانەی کە لە دڵی خەڵکا جێی گرتووە و بووەتە هۆی وێستانی بیری ئەوان، بکەوێتە جووڵە و بیر و بڕوایان رۆشن بێتەوە.

بەڵامئەم بیر و بڕوایە لە راستەقینە دوورە و پێچەوانەی ئەوەیان بە ئێمە پیشان داوە، بۆ وێنە لە ئاسیا و ئەمریکای لاتین دا هەندێ ولات هەبوو کە قومارخانەی

خۆرئاوا ئەهاتە ئەژمار، وە ئەو وڵاتانە کە خەڵکەکەی خـۆیان بە رۆشـنبیر ئـەزانن جێگای تووڵانەوە و فەساد و سەرمایەدارەکانی خۆرئاوایە، وە لە بەر ئەوەی بڕوایان بە ئایین نیە هەمیشە لە پەستیدا ئەژین.

ئەم دەستە هەرگیز خۆیان پێبەندی ئایین ناکەن چونکە لایان وایە کە بە هۆی تێپەڕینی زەمان ئەو کەسانەی کە پێوەندیان بە ئـایینەوە هەیە و پێبەندی ئـایینن کەم کەم بیریان ئەگۆڕێ و رۆشن ئـەبێتەوە و بیری پێشـوویان لە بیر ئـەچێتەوە، بەڵام ئەم قسانە بە پێچەوانەی راستەقینەیە، چـونکە لە ئـاسیا، وە لە ئـەمریکـای لاتیندا وڵاتگەلێ هەبوو کە قومارخانەی خـۆرئاوا ئـەهاتە ئـەژمار. وڵاتگــەلێ کە باشترین زانایان و هەڵکەوتووانی خۆیان، باشترین رۆشنبیرانیان ئـەکردە نۆکەری بێگانە.

ئەو وڵاتانەی کە لە ماوەی سەدەکان دا لە گەڵ کەڵەگایی و بێگـانە پەرسـتی و خۆ بە دەستەوەدان دا لە بە رامبەری هێزەکانی بیانی دا خوویان گرتبوو کەساسی و کەنەفتی خۆیان باوەڕ ئەکرد، وە ئەگەر کۆمەڵ ناسێ سەرنجی ئەو خەڵکەی بدایێ بوچکترین ئـــومێدیکی بەوە نەبوو کە لە چــەندین ســەدەی تردا جــووڵانەوە و بزووتنەوەیێ لە ناو ئەو کۆمەڵە دا بێتە دی.

بەڵێ لە ناو کۆمەڵ وگەلێکـی وا دا کوتوپڕ پەرجـۆیێ رووی دا، ئــەویش چ پەرجۆو مۆجزەیێ، پەرجـۆیێکی سـەرسـووڕهێنەر کە کۆمەڵ ناسـەکان نەیانتوانی بزانن و ســەردەرهێنن نەتەوەیێ کە تووڵانەوە، زەبوونی، بێسـەوادی، نەزانی، کۆنەپەرستی، پڕوپووچ و دیلی و کەنەفتی کە لە تەواوی ژیانیانا هەست ئـەکرا لە پڕ راپەڕین و هەڵسان، وە خوێنی گەرمی ژیان لەوان دا کەوتە جموجووڵ، وە ئەو رووبەندە بێ بایی و ناپەسەندەیان لە روومەتی خـۆیانا فـڕە دا و خسـتیانە دوور، وە هەر ئەو بنەچەکە و رەچەڵەکە بووە کۆمەڵێکی ئازاد و سەربەخۆ و سەربەست و وریا و بەرپرسیار، وە لە دەروونی گەلێکـی مردوودا دەرچـوو و پاك بووەوە، وە کوتوپڕ جووڵانەوە و بزووتنەوەیان بە دیهات و ئەم گەلە چەوسـاوە و کەنەفتە لە پڕ گیانی گرت و جووڵایەوە و هەموو یەکدەست و یەك گیان راپەڕین و هەر ئەو قـومارخانە بەناوبانگانەی خۆرئاوا و هەر ئـەو وڵاتانەی کە شـوێن و مەکۆی خـراپە و جـێی قومارخانە و قـاچاخخانەی جیهـانی بوو، کوت وپڕ بووە شـوێن و جێگـای ژیان و

بیر کردنەوە و جووڵانەوە.

بێشك لێرەدا ئـەم جـــووڵانەوە بە هۆی مێژووی چـــەوســـاوەیی و دژواری و ڕیٚورەوشتی ئەو گەلەوە هاتووەتە دی، وە ئەم ڕیٚورەوشــتە کەلە ئـاییلی گەلەوە بەدی هاتووە لە دڵی هەر مرۆیێك دا هەیە، وە هەر وەها ئەم ڕیٚورەوشتە ئـاگرێك لە دڵی هەر مرۆیێكدا ئەکاتەوە،وە ئەو ئاگرە ئاگرێکیخوایی‌یە کە ئـەگاتە زەوی و هەموو شوێنێکی لیٚروون ئەبێتەوە و پاشان زستان و تاریکـی لە ناو ئـەبا و وەکوو گوڵ لە دڵی خەڵکا ئەپشکیٚ و ئەوسا خەباتی بلیمەتەکان و قـا ، مانەکان و مێژوو بەرمو لای خۆی ڕائەکیٚشیٚ، واتە لە بڕوا و ئـایینەوە سـەرچـاوە ئـەگریٚ، وە هەر تیشکی ئەو ئـاگرەیە کە بە هێزی بیروبڕوای ئـایینەوە گەلێك کە لە ماوەی چـەن صەد ساڵ و تەنانەت چەند هەزار ساڵا کە لە تاریکی دا ماوەتەوە ڕزگار ئەکا.

تەنانەت ڕۆشـــنبیران و کۆمەڵناســـان ئـــەوان بە دوا کە وتوو ئـــەزانن، وە گەلەکەش چونکە ساڵان بە هۆی گەڵەگایی خـۆرئاواوە چـەوسـاوەتەوە، وە لە بەر ئەوەی هەر بڕوایان بە ئایینەکەیان بووە پاشان بە هۆی هێزی ئـەو ئـایینەوە ڕێك ئەکەون و ڕائەپەڕن و خۆیان لە ستەم و ئاستەمی ئەوان ڕزگار ئـەکەن، وە ئـەمە تاقی کردنەوەیێکە کە ڕەچەڵەکی جوان لە پاش شـەڕی دووهەمی جیهـانی‌یەوە بە دەستی هێناوە. تەنانەت هەمووی ڕۆشنبیرانی نائومێد ئومێدەوار ئەکا.

هەر نەتەوە و گەلێك کە لە دیلی و کەنەفتی و چـەوسـاوەیی دا لە ژێر ڕکێفـــی کەڵەگایی دا بیٚ، ئەگەر بڕوای بە ئایین بیٚ سەرئەنجام لە دیلی و کەنەفتی ڕزگاری ئەبیٚ. ئەو ڕۆشنبیرانەش کە لەو وڵاتانەدان و لە جـووڵانەوە و ڕاپەڕینی گەلەکەیان ناهومێدبوون، بە هۆی بزووتنەوە و یەکیەتی گەلەکەیان هومێدەوار ئەبن. وە ئـەو چەشنە ڕۆشنبیرانە ئەبیٚ بزانن کە لە ناو هەر گەلێکا ئەگەر بڕوای ئـایینی بتەو بیٚ، جـووڵانەوە و بزووتنەوەییٚکیان تێدا پەیدا ئـەبیٚ و ئـەو دەســتە و گرۆیانەش کە لە ناویانا بلاوەیان کردبیٚ بە هۆی ئەو بزووتنەوە یەك ئەگرن و بەم چەشـنە گەلێکـی یەکدڵ و یەكگیان کۆ ئەبێتەوە و وڵاتەکەیان لە دەست ناموٚ و بێگانە ڕزگار ئەکەن و کۆمەڵەیێکی ئازاد و سەربەست بەدی دێنن.

بە پیٚی وتەی فرانس فانوون ئەم چـەشـنە گەلانە لە ڕەگەزێکـی نویٚ لە گەڵ بیروراییٚکی نویٚدا بەدی دێنن. یەکیٚ لە زانایانی خۆرئاوا ئەڵیٚ: خۆرئاوا نەژادێکـی

خاوەن کار و کاربەدەستە، وە خۆرهەڵات نەژادێکی کرێکار و پەستە، وە هەر بەم بۆنەوەیە، کە سروشت نەژادی کرێکار پتر ئەکا و نەژادی خاوەن کار کەمتر.

لەم بارەوە زیگفریدیش ئەڵێ: خۆرئاوایی مێشکی پیشەسازی و ژیاری هەیە، بەڵام خۆرهەڵاتی مێشکی هەست و دڵسۆزیەتی هەیە و لە بیرکردنەوە و رێگەدانان و جووڵانەوە دوورە. مۆریس توورزی فەرانسەوی کە یەکێ لەرێبەرانی سووسیالیستەکانی جیهانە ئەڵێ: نەتەوەی جەزایر، نەتەوەی ئەفریقا، نەتەوەی باکووری ئەفریقا، نەتەوە نین و هێشتا پێ نەگەیشتون و نەبوونەتە نەتەوە. واتە فەرانسە بە سەر ئەم نەتەوانەدا زاڵە، وە ئەمانە ناچارن لە بەر ئەوەی بە شارستانیەت شارەزا بن، وە بۆ ئەوەی نەتەوەیێکی شارستانی بن ئەبێ تا ماوەیێ لە باوەشی دایکی نامیهرەبانی ئیمپریالیزم دا بژین و بەخێو بکرێن، وە ئەمە بیر و کەڵکەڵەی ئەم زانا سووسیالیستەیە.

نەتەوەی قارەمانی جەزایر کە ناویان نابووە مشکە دەشتینە، دیمان کە بە هۆی یەکیەتی، وە بە هۆی هێزی بڕوا و ئایینەوە راپەڕین و خۆیان لە زۆر و ستەمی کەڵەگایی رزگار کرد و ئاڵ و گۆڕێکیان لە وڵاتەکەیان‌دا بەدی هێنا. بەڵێ فەرانسە کە هەموو دەم شانازی بەوە ئەکرد کە بێشکە و لانکی ئازادی و ئازادی خوازی جیهانە، پاریسێ کە شانازی بەوەوە ئەکرد کە لە هەر قاوەخانەیێك دا تۆمی یەکێ لە شۆڕشەکانی گەورەی جیهانی ریشە دائەکوتێ، پاریسێ کە بانگەوازی ئەکرد و ئەیوت باوەشی من بۆ هەموو ئیدئۆلۆژیکەکان و بیر و ڕاکان و هەموو جووڵانەوە و بزووتنەکان و هەمووی شۆڕشەکان کە مێملێ یەکترن کراوەتەوە. پاریسێ کە لای وابوو ئەوەندە بەهێزە کە ئەتوانێ قووڵترین بیرەکان و دەستەکان و هێزەکانی جیهانی بە بێ ترس وەرگرێ.

پاریسێ کە ئەوەندە بیروڕا و ئیدئۆلۆژیك و دەفتەری رۆژنامەی میریوەکوو: دەفتەری رۆیالیستەکانی لایەنگرانی بنەماڵەی لۆیی و لایەنگرانی ئانارشیستەکان و تەنانەت پەیڕەوانی یووگا و شۆڕشگێڕەکانی ئەفریقا و ئەمریکای لاتین و هەندێ تری هەبوو، وە بە خۆی شانازی ئەکرد کە شارستانیەتیکی ئوروپایی و دموکراتیکی خۆرئاوایی و لیبراسیمێکی بەهێزی هەیە، بەڵێ هەر لەم پاریسەدا کە لە گەڵ وڵاتەکانی شۆڕشگێڕی ئاسیایی‌دا پەیوەندی رامیاری هەبوو رۆژنامەکانی

ئەوانی چاپ ئەکرد، بەڵام نووسەرانی ئەو ڕۆژنامانە هەر کە لار بجوولاییەنەوە و نووسراوەکانیان لە گەڵ بیروڕای ڕامیاری فەرانسەدا هاوچەشن نەبوایی ئەو ڕۆژنامانە دا ئەخرا و ئەبەسترا.

بە پیێی و تەی سارتر کەس نەیئەتوانی وزەی لێوەبێ و هەر کە قسەیێك لە زمانی یەکێکەوە بکرایێ و ئەو قسە رەخنە بوایێ یا پێشنیار، ئەو کەسە ئەگەیە سزای خۆی، وە یا گوڤاریێ لە لایەن دەستە و گرۆیێکەوە دەربچوایێ دەوڵەتی فەرانسە ئەکەوتە مەترسی‌یەوە.

هەر وەها وتمان هەرنە تەوەیێ پیێبەندی ئایین و ریێ و رەوشت و فەرهەنگی نەتەوایەتی بێ سەرئەنجام رزگار ئەبێ، وە ئەمە پەرجوو و موجزەییێکە کە بڕوا و باوەڕ ئەیباتە سەر، وە هەمووی ئەو ڕشتانە کە جوولاکانی فەرمانڕەوای مێژوو لە درێژایی سەدەکانا بە کوێرایی دەستەییێك دورستیان کردووە کوتوپڕ ئەیکاتە لۆکە و پەموو و پاشان ئەیسووتێنێ و ئەیکاتە خۆڵەمێش، وە هەر وەها سەرمەشقێکە بۆ هەمووی ئەوانە کە نایانەوێ هیچ یەك لە قاڵبەکانی رەوشتی میری رابردوو، وە یا رەوشتەکانی خۆرئاوایی وەرگرن. بەڵکوو خۆیان ئەبێ بیر بکەنەوە و ڕێگای خۆیان هەڵبژێرن، وە ئەگەر وا نەبێ لە ناو کۆمەڵ دا بێ پەنا و بێ جێ ئەمێننەوە.

کە وا بوو ئەبێ پشت بە خۆیان ببەستن، وە ئەگەر بتوانن لە سەر قسە و بڕوای خۆیان پایەدار و بەردەوام بن و لێیان بوەشێتەوە و بتوانن لە بایی بێوەری بوونی خۆیان تێگەیێن و لە گەڵ و شەدا ژیان بەرنەسەر و هاوڕێ لە گەڵ بیروڕای بتەودا بەردی تەمەنیان داچنن و بە پیێی بیروبڕوای ئایینی و ریێورەوشتی نەتەوایەتی هەناسە هەڵکێشن، وە بە بڕوای بتەو قایمەوە بمرن، ئەبێ هیوادار بن کە ئەو پرشنگی بڕوایە کە لە دڵی کۆمەڵ دایە کوتوپڕ تیشك ئەداتەوە، وە ئەو سەهۆڵی نائومێدی‌یە کە گەل و کۆمەڵی لاواز و بێتین کردووە ئەیتاوێنێتەوە، وە لە نێوانی دواکەوتن و نەزانی و بێبەرپرسیاری دا لە پڕ کۆمەڵێك دێنێ کە یەکدڵ و یەك‌گیان بەرەو ئامانجێکی ڕاستەقینە هاوڕی لەگەڵ ئەوین و هێزێکی بەتینی ئایینی و کۆمەڵایەتی دا ڕائەپەڕن و خۆیان لە چنگی زۆردار رزگار ئەکەن.

لێرە دا ئەبێ ئەوەش بڵێین مەبەستی بنەڕەتی کە لە نێوانی ڕۆشنبیران دا ئێستا ئەبێ بێتەدی ئەوەیە کە: ڕوشنبیرانی ئەفریقا، ڕۆشنبیرانی ئەمریکای لاتین،

ئاسیا، بیر له گەڕانەوە سەرخۆ بکەن. ڕەنگــە بپرســن گەڕانەوە. ســەرخــۆ بۆسەرچی؟. لەوەڵاما ئەڵێن: گەڕانەوە سەرخۆ بۆ ئایین و بڕوای خــۆمان، بۆ ئـازاد بوون و رزگار بوون له زۆر و ستەمیٚ زۆرداران و ســتەمکــاران. هەر وەها ئـەزانین کە گەلی ئازادی خوازی ئێران هەموو دەم پیٚبەندی ئایینی پیرۆزی ئیســلام بووە، وە هەموو چینەکانی گەلچ وەرزێر و جووتیار و کرێکار و خوێندەوار و نەخـوێندەوار و خـوێندکار و مامۆســتاپیٚبەندی ئـایینی پیرۆزی ئیســلامن، وە هەموو چینەکانی گەل گەلیٚ بڕوایان بتەوو قایمە، تەنانەت ڕۆشــنبیرانیش ئــەم بڕوا بتەوەیان هەیە. بەڵام بەداخەوە لەم دوایییەدا هەندیٚ له ڕۆشبیران هەست بە بەرپرســیاری ناکەن و بوون بە دوو دەستە، دەســتە یێکیان پشــتیان بە ئـایین و کۆمەڵ بە ستووە، وە دەستەیێکیتریش تەنیا بە ئایین بڕوایان هەیە و بەس.

بەڵام هەمووی ڕۆشــنبیرانی گەلەکەمان ئــەبیٚ کەمیٚ بیر کەنەوە و بگــەڕێنەوە سەرخۆیان و وشیار بنەوە، وە ئامانج و مەبەســتی خــۆیان دیاری و دەســت نیشــان کەن، وە نەخشــــی کۆمەڵایەتی و ئـــامانجیٚ کە ڕۆشــــنبیران و خــــوێندە و ارانی کۆمەڵەی ئیسلامی و ئاسیایی کە بە ئەستۆیانەوەیە دیاری کەن.

بە پیٚی درۆشمیٚ کە ڕۆشنبیرانی ئایینی له شــەڕی جیهــانی دووهەم دا بڕوایان پیٚی بوو هەر گەل و کۆمەڵێك ئـەبیٚ بە پیٚی مێژوو و فــەرهەنگــی خــۆی بیر بکاتەوە، لەم ڕێگاوە بە ئامانجەکانی بگا، وە ئۆزگان و ئەمەسەزر و فرانس فانوون و ئووژن ـ یۆنسکۆ ئەم بڕوایەیان پەسەند کردووە، وە هەر ئەم ڕۆشنبیرانە ئەڵێن: هەر گەل و کۆمەڵێك ئەبیٚ بە پشتیوانی مێژو و فەرهەنگ و زمان و ئـایینی خـۆی ڕێگای ببڕیٚ، وە بە پیٚی ئەم درۆشمانە ژیان باتە سەر تا سەرکەون و نەگەون.

گەڕانەوە سەرخـۆ و بیرکردنەوە و وشـیار بوونەوە درۆشـمیٚ نیە کە ئێســتە له جیهان دا وترا بیٚ. بەڵکوو زۆربەی ڕۆشــنبیرانی پێشــڕەویش کە بڕوایان بە ئـایین نیە ئــەم مەبەســـتیانە بۆ یەکەمین جــار درکاندووە. هەندیٚ له نووســـەرانیش کە بڕواییێکی بتەوی ئایینیان نیە له بارەیٚ بیرکردنەوە و گەڕانەوە سەرخۆ دواون. ئــەم نووسەرانە بریتین له: ئەمەسەزر ـ فرانس فانوون ـ ژۆلیۆس نیٚرەرە ـ جۆمۆ کنیاتا ـ کاتب یاسین جەزایری ـ جەلال ئال ئــەحمەد کە باســیان له گەڕانەوە ســەرخــۆ کردووە. وە ئەم نووسەرانەش له ڕۆشــنبیرانی گەورەی جیهــان دێنە ئـەژمار کە له

بزووتنەوەی گەلەکانیشــیانا دەســتیان هەبووە، وە لە ڕێبەرانی دژی کەڵەگایی دەژمێرڕێن، وە هەر کام لەوان لە وڵاتی خــۆیانا بزووتنەوەییکیان هەبووە و بۆ گەلەکەیان تێ‌کۆشاون.

با بێینەوە سەر نیشــتمانەکەی خــۆمان ئێرانی خــۆشەویسـت کە هە مووومان لە بەرابەری ئــەم خــاکە پیرۆزە دا بەرپرســیارین. لێرە دا کاتێ ناوی نیشــتمان دێتە پێشەوە لەســەر هەموو چینەکانی گەلە کە بە دڵ و گیان بۆ پاراســتنی تێ‌کۆشــن و ژاری لە سەر بنۆشن، وە هەمووی چینەکانی گەل و کۆمەڵ بەرپرسیاری نیشتمانن و ئەبێ کارێ بکەن کە نیشتمان لە ژێر چنگــی بێگــانە دەرێنن و وڵاتێکــی ئــازاد و سەربەخۆ بە دی بێنن تامافی هەموو کەسـێك بدرێ و هەموو بە جـارێ بە ئـاواتی خۆیان بگەن.

گەڕانەوە ســەرخــۆ و بیر کردنەوە بۆ هەموو گەل و کۆمەڵێك پێویســتە، وە ئــەم ڕێگایە چــەند ڕیَ‌یتری لێ جیا ئــەبێتەوە وەکوو: گەڕانەوە بۆ ســەر فــەرهەنگ و زمانی خۆ. وە لەم ڕێگەداسەرەتا ئەبێ لە فەرهەنگ و زمانی خــۆمان تێ‌گەیین، بە تایبەت تێ‌گەیشــتن لە فــەرهەنگ و ئیدئــوڵۆژیکی ئیســـلامی کە پە یوەندی بە فەرهەنگی گەلەوە هەیە. ئەڵبەت ئەوەش ئــەبێ بڵێین فــەرهەنگــی ئیســـلامی فــەرهەنگێکــی ئــایینی‌یە، وە هەمووی چینەکانی گەل بڕوایان پیَ‌یە، وە ئــەمە لە گەڵ فەرهەنگی نەتەوایەتی‌دا کە ئەبێ بیووژێتەوە و زیندوو بیێتەوە توفیری هەیە. فەرهەنگی ئیسلامی یا ئیدئولۆژیکی ئیسلامی ڕێگاییکە کە ئەبێ هەر موسڵمانێك لە سەر ئەوڕێگەیە بڕوا، ئەم ڕێگەش ئەبێ بۆ خەڵك شی‌بکرێتەوە و ببووژێتەوە.

خــۆرئاوا لە ســەدەی هەژدەهەمی زاین‌دا بە یارمەتی کۆمەڵناســـان و مێژوونووســان و نووســەران و هونەرمەندانەوە شــارستانیە تێکیان پێکــەوە نا، وە ئێستە ئەیانەوێ بە گەلەکانی جیهان بڵێن ئەم شارستانیەتە تەنیا شــارستانیەتێکــە کە خۆرئاوا پێکەوەی ناوە و داویەتە جیهان، وە هەر کەس بیەوێ شــارستانی بێ، ئــەبێ ئــەو شــارستانیەتە کە ئێمە دامانناوە وەری‌گرێ و بیچــوێنێ و باختی کا، وە ئەگەر رووی لێ‌بپۆشێ ئەبێ هەر ڕەمەکی بمێنێتەوە.

دیسانەوە خۆرئاوایی‌یەکان ئەڵێن: فەرهەنگ و زانست لە جیهــان دا تاقــانەیە و ئەویش فەرهەنگ و زانستی خۆرئاوایە، وە هەر گەل و کۆمەڵێك ئــەگەر بیەوێ لە

سەدەی بیستەم دا فەرهەنگی بیێ ئەبیێ فەرهەنگی خۆرئاوابستێنێ، هەر وەها کە کاڵای خۆرئاوا ئەستێنێ و بەکاری ئەبا، وە هەر کەسێ ئەگەر بیەوێ تەلوزیۆنی بیێ ئەبیێ ئەلوزیۆنی خۆرئاوایی بکڕێ، وە ئەگەر ئەم کارانە نەکا شارستانیەتی نیە و ڕەمەکی‌یە. بەس بە پیێ قسەی خۆرئاوایی‌یەکان ئەگەر کەسێك نەکەوێتە شوێنی فەرهەنگی ئەوان و لە دووی ئەوان نەڕوا و کلکەسووتەیان بۆ نەکا ئەو کەسە ئیتر بەوان ناگا و هەر ڕەمەکی‌یە و نەزان.

بە ڕاستی ئەم قسە قسە یێکی سەرسوورمانە، وە هە موو کۆشش و تەقەلای خۆرئاوایی‌یەکان بۆ ئەوەیە کە گەلەکانی جیهان بەم قسە پڕوپووچانە هەڵخەڵەتێنن و ئەوان لە ئایین و بڕوای خۆیان بیێوەری کەن تا خۆیان بە ئامانجی شوومیان بگەن، وە بەم چەشنە بەرەبەرە خەڵك لە فەرهەنگ و ڕیێ و رە وشتی نەتەوایەتی و ئایین و بڕوای خۆیان لادەن و بیانکەنە دیل و ئێخسیری خۆیان، وە کەم کەم ڕێگای بیێ‌ئایینی و بیێ‌بڕوایی بە لاوان و گەنجائی گەلەکان پیشان دەن و بەرەو ڕێگایێکی چەوت و چەوێڵ و نالەبارهەڵیا نخەڵەتێنن. بە ڵام نەخۆرانیان بیێ و ئەبیێ ئەوە بچێتە گۆی‌یانا کە گەلی موسلمان هەمیشە بیر و بڕوای بتە و قایمە، وە ئەم گەلە سەرئەنجام بە ویستی خۆی ئەگاو نەیاران و دوژمنانی گەل و نیشتمان لە وڵاتەکەی دەرئەکا، وە بە سەر دوژمنانی خۆیا سەرئەکەوێ و زاڵ ئەبیێ.

خۆرئاوایی‌یەکان بە هۆی شارستانیەتیێ کە لە سەدەی هەژدەمی زایین‌دا پێکیان هێناوە ئەیانەوێ هەمووی گەلەکانی جیهان بچەوسێننەوە و بیانخەنە سەر ڕیێ‌وڕچەی بیێ‌باوەڕی خۆیان، وە ئەگەر هەرکەسیێ لە سەر ڕێگای ئەوان لادا بە شارستانی دانانن و پیێ ئەڵێن ڕەمەکی و نەزان. ئەمەیە کە مۆریس توورز ئەڵیێ لە ئەفریقادا نەتەوەیێ بە ناوی نەتەوەی ئەلجەزایر نیە. بەڵکوو نەتەوەیێکە کە ئەبیێ پیێ‌بگەیێ. ئەم قسانە لە بەر ئەوەیە کە ئەیەوێ شارستانیەتی گەورەی باکووری ئەفریقا کە لە چەند سەدەی پێشوودا گەورەترین فەیلەسووفی جیهان و دامەرزێنەری کۆمەڵ ناس کە لەوێ‌دا پیێ‌گەیی بە هیچ دابنیێ و نە یهێنێتە بەرچاو. کاتیێ لە باکووری ئەفریقا دا شارستانیەتیێ گەورە هەبوو، خۆرئاوایی‌یەکان شانسۆن دوورلاندیان هەبوو، وە کاری وێژەیی‌یان ئەمە بوو کە بۆ کاروانی‌یەکانی مەسیحی کە ئەچوونە زیارەت ئاوازی کۆڵان باخی‌یان ئەوت.

لەو سەردەمەدا تەنیا شوێنێ کە لە خۆرئاوا دا شارستانیەتی هەبوو وڵاتی ئسپانیا بوو کە لە هەموو شتێکا لاسایی وڵاتی مەغربی ئەکردەوە، وە ئەم وڵاتە لە باکووری ئەفریقا دایە. بەڵام خۆرئاوایی یەکان ئەیانەوێ هەمووی شارستانیەتەکانی رابردووی گەلەکان لە ناو بەرن، تا ئەو قاڵبانەی کە دایانرێژاوە بە زۆر بیسەلمێننە گەلەکانی جیهان. وە چەپاو و تاڵان و کوشت و کوشتاری نەتەوەکانی جیهان هەر لە چینەوە تا ئێران، وە هەر لە ئێرانەوە تا میصر سەوقاتی شارستانیەتی خۆرئاوایی‌یەکانە، هەر وەها ئەزانین هەر کام لەم وڵاتانە شارستانیەتێکی گەورەیان هەبووە.

بۆ خۆرئاوا مۆنۆکوولتوور یەکێ لە بەرهەمەکانی کەڵەگایی‌یە، وە لە بەر ئەوەی کەڵەگایی خۆی بە سەرۆکی جیهان وە تەواوی جیهان بە مەزرای خۆی بزانێ، ئەمەیە کە یەك رشتە کردنی دەستهاتی وڵاتەکان یەکێ لە بەرهەمەکانی کەڵەگایی‌یە.

بۆ وێنە کاتێ ئەبینێ کە لە کوبا دا نەیشەکەر باش دێتە بەرهەم ئەڵێ: تەواوی وڵاتەکان ئەبێ نەیشەکەر بکێڵن، وە ئەو وڵاتانەی کە نانیان بۆ خواردن نیە ئەبێ لە ئەمریکا گەنم بکڕن. یا نەتەوەی موسڵمانی باکووری ئەفریقا لە بەر ئەوەی وڵاتەکەی هەمیشە هەتاو ئەیگرێ ئەبی هەموو کشت و کاڵێکی لە ناوبچێ و تەنیا مێو و رەزی تێدا بکێڵرێ تا شەراب و بادەی لێ‌بهێننە بەرهەم. بەم چەشنە کاتێ باکووری ئەفریقا هاتە رووی کار، دی‌یان کە تەواوی وڵاتەکەیان بووەتە مێو بۆ شەراب، لە گەڵ ئەوەش دا هەموویان موسڵمانن و لە بنەڕەتا شەراب ناخۆنەوە کەچی شتێکی تریشیان نیە بیخۆن وپێی بژین.

کوولتوور لێرەدا کە باسمان لێوە کرد بە واتای مەزرا و فەرهەنگە، وە کوولتوور کردنی کشت‌وکاڵ و کوولتوور کردنی شارستانیەتەکان و فەرهەنگەکانی نەتەوەکان لە جیهان دا کاری کە ڵەگایی‌یە. وە ئەم رەوشتە کە کەڵەگایی دایمەزراند بوو بووە هۆی ئەوە کە وڵاتە کانی دەستکورت و هەژار بەرهەمی مەزراکانیان ئەفرۆشتە خۆرئاوا. بەڵێ کەڵەگایی یا ئیستعمار ئەم کارەیە بۆ ئەوە کردووە کە هەر خۆی سوود بیا و گەلەکانی جیهان بە جارێ بچەوسێنێتەوە و بیخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە، وە هەموو دەم تێ‌ئەکۆشێ کە فەرهەنگ و وێژە و

ڕێورەوشتی نەتەوایەتی و بڕوای ئایینی گەلەکان لە ناو بیاو شـارستانیەتی خـۆی کە بریتی‌یە لە خراپە و کاری نارەوا و بێ‌بڕوایی و کوشت و کوشتار بیخاتە ناو ئەو وڵاتانەوە، وە هەمیشە هەوڵ و تەقەلا ئەدا کە فەرهەنگی پیس و چەپەڵی خـۆی لە ناو گەلەکان دا بڵاو کاتەوە، وە شـــارستانیەتی ئـــەوان لە ناو بیا، بە تایبەت شارستانیەتی ئاسیایی و ئەفریقایی و ئێران و هەموو گەلەکانی جیهان دروێنەکا.

لە بەر ئەوەی کوولتووری فەرەنگـی و کەڵەگایی لەو وڵاتانە دا پەرەبسـتێنێ، وە نەتەوەکان لە هەر رەگەز و نەتەوەیێك بن و هەر مێژوو شـارستانیەتێکـــان هەبێ، ئەبێ بە شێوەی گۆزەگەلێکی خـالی بە چـەشـنی یەك دەربێن بە جـــۆرێ کە هیچ شتێکیان نەمێنێ جگە لە گەڕوویێکی تینوو تا هەمیشە پێویسـتیان بە وانەوە بێ،وە ئەوانیش واتە خوێنی گەلەکان بمژن و بیانکوژن.

هەر وەها وتمان خـۆرئاوایی‌یەکان ئـەیانەوێ هەمووی گەلەکانی جیهـــان بچەوسێننەوە و بیانخـەنە ژێر رکێفـی خـۆیان، وە لایان وایە هەر کەســێ کاڵای خۆرئاوایی بکڕێ، وە بە ماشینی دەستکردی خـۆرئاوایی رێگـە ببڕێ ئـەو کەسـە شارستانی نیە بە ڵکوو چەشکەی شارستانیەتی کردووە، وە بڕوایان لە سەر ئەوەیە هەر کەسێك بیەوێ ببێتە شـــارستانی و لە شـــارستانیەت بەشـــدار بێ، ئـــەبێ فەرهەنگی نەتەوایەتی و ئایینی خۆی لە ناو بیا و فەرهەنگی خـۆرئاوایی وەرگرێ. چـونکە خـۆرئاواییەکان لایان وایە کە گەلەکانی‌تری جیهـــان ناتوانن ژیار و فەرهەنگ بەدی‌بێنن مەگەر واز لە فەرهەنگی نەتەوایەتی خۆیان بێنن، وە بە هۆی فەرهەنگـی خـۆرئاوایی‌یەوە شـارستانیەت و ژیار بهێننە دی، هەر وەها لایان وایە شارستانیەت بە هۆی ئامراز و کاڵای خۆرئاواوە دێتە دی.

ئەوانەی وا خۆیان فرۆشتووە و پەیرەوی لە خۆرئاوا ئەکەن لایان وایە کە ئـەو دایکانەی وا سەتار خان و شۆڕشگێڕانی ئازادی خـوازی‌تریان لە باوەشـی خـۆیانا پەروەردە و بەخێو کردووە شـارستانی نین. بەرلەوەی کەڵەگایی بڕواتە ئـەفـــریقا لاوێکی ئەفریقایی بە ئەسپ و سەگ و مەڕەکەی خۆی شانازی ئەکرد، بە ڵام هەر کە کەڵەگایی چووە ئەوێ، سەرەك هۆزی ئـەفـــریقایی ئـــەسپەکەی بە ماشـــین گۆڕیەوە و چووە ناو ماشینەکەی و گازی دا، دڵی بەوە خۆش کرد کە شارستانیە.

یەکێك لە نووسەران ئەیوت: خوا باوەکوو بەم فەرەنگیانە پووڵ و هێز و هۆشی

داوه که چی ئەوان ئەبێ وەکوو نۆکەر بڕۆنە کان و کارخانەکان و ماشین و ئـامراز دورستکەن تا موسـڵمانان کەڵکــی لێوەرگرن. بەڵێ بەم چـەشـنە کە خـۆرئاوایییەکان بیری لێئـەکەنەوە ئـەبێ گەلەکانی چینی، ژاپۆنی، ئێرانی، عەرەب، تورك، رەش، سپی هەموویان ببنە هیچ و پووچ و پێویسـتیان بە خۆرئاوایییەکانەوە بێ و رێگەی ئـەوان ببڕن و دەسـت لە رێورچــە و ئـایین و فەرهەنگی خـۆیان هەڵگـرن، وە هەر وەها دەسـت لە مێژوو و رێ و رەوشـت و کەلەپووری نەتەوایەتی خۆیان بکێشن. کە وابوو هەموو کەلەپووری نەتەوایەتی و رێورەوشـتی ئـەو نەتەوانە و رەگەزانە کە پەیوەندیان بەوانەوە هەیە ئـەبێ لە ناوبچێ تا بە چەشن و شـێوەیی درەبێ ئـەو گەل و کۆمەڵە بە کاڵا و فـەرهەنگــی خۆرئاوا شــانازی بکــا، وە ئــەو هەموو نەتەوانە کە هەر کام فــەرهەنگ و رێورەوشــتێکی تایبەتییان هەیە لە دەســتی بدەن، وە هەمووی نەتەوەکان لە سەرخۆیان بچن و بیروڕای خۆیان لە دەست بدەن، وە ئەمەش کاری کەڵەگایی یا ئیستعمارە.

بەراستی بزانین لە سەر خۆچوون یانێ چـی؟. هایدگر ئـەڵێ: هەر کەسـێ دوو خۆی هەیە. خۆیێکی ئەوەیە کە ئەڵێ من. کاتێ ئەڵێ من خۆی بە یەکێ لە گەل و نەتەوەی نیشتمانەکەی ئەزانێ، وە ئەزانێ کە لە باوك و دایکێکـەوە بەدی هاتووە، وە بەیارمەتی ئەوان پێگەیشتووە. وە خۆیێکی تری خۆی رەگەزایەتییە. وە خۆی دووەم لە هەموو کەسێك دانیە، وە خۆی دووهەم فەرهەنگ دا ئـەنێ و فـەرهەنگ ئەبووژێنێتەوە. خۆی یەکەم لە ماوەی سی ساڵ و چل سـاڵی تەمەن دا ناسـنامە و سـجیلی بە خـۆ نازین و منی هەیە، بەڵام خــۆی رەگەزایەتی هەر وەها و تمان فەرهەنگ و پیشە و هونەر دائەنێ و ئەمانە سرشت ئـەکا، وە ئـەو پێشـڕەوتانە کە ئێستە کەوتووەتە جیهان دەستکرد و دانراوی خۆی دووهەمە.

کە وا بوو ئەو کەسـانەی کە من منیانە و هەر بە خـۆیان ئـەنازن شــتێکیان لە دەست نایێ، بەڵام ئـەوانەی کە خــۆی رەگەزایەتییان هەیە لە پیشــەســازی و فەرهەنگ و هونەردا ســەرکەوتوون، وە ئـەم خـۆیەش بێگومان بە هۆی خـوای مەزنەوە بەدی هاتووە، وە خوایە کە ژیری و ئاوەزی بە ئـەو داوە و کەو تووەتە ناو بیر و کەڵکەڵەوە تا بە گەل و کۆمەڵ و تەواوی بەندەکان راژە و خزمەت بکا، وە لە

خزمەتی ئەو جۆرە کەسانەیە کە هەمووی بەندەکان ئەحەسێنەوە. کە وابوو هەموو سەرچاوەیێک ئەگەڕێتەوە بۆ خوای گەورە و مەزن.

سارتریش ئەڵێ: هەموو شتێك ئەگەڕێتەوە بۆ خوای مەزن و دڵاوا، وە ئەو بەدی هێنەری هەموو شتێکە و سەرچاوەی هەموو شتێك ئەگەڕێتەوە بۆئەو. سارتریش بڕوای هەر بە دوو خۆیە و لەم بارەوە ئەڵێ: خۆی یەکەم خوا بەدی‌ی هێناوە. وە خۆی دووهەم بە دەستی مرۆڤەوە بەدی دێت. خۆی دووهەم کە خۆی راستەقینەیە، کە سایەتی فەرهەنگی و زانیاری مرۆ پیشان ئەدا، وە هەرکەسێ ئەم خۆیەی بێ مرۆیێکی سەربەست و سەر بە خۆ و شت بەدی هێنەرە. مرۆی شت بەدی‌هێنەر مرۆیێکە ماشین و ئامرازی جۆربەجۆر دورست ئەکا، مرۆیێکە بیر و کەڵکەڵە بەدی دێنێ، ئیدئۆلۆژی بەدی دێنێ ، وە بڕوا و باوەڕ بەدی دێنێ و ئەکەوێتە بزووتنەوە و راپەڕین. ئەوەش ئەبێ بڵێم: هەر نەتەوەیێ کە بیەوێ بە پلە و پایەی بەرز بگا و دەردی ئۆخژن بێ، ئەبێ بیر و کەڵکەڵەی نوێ و بڕوا و زانیاری و فەرهەنگ بەدی‌بێنێ، وە ئابووری و پیشەسازی بەدی‌بێنێ، وە ئەگەر لەم رێگەوە تێ‌نەکۆشێ بێ‌گومان ئەکەوێتە ژێرباری خۆرئاواوە، وە کەڵەگایی فریوی ئەدا و ئەیچەوسێنێتەوە.

گەلێکی بەدی‌هێنەر گەلێکە کە خۆی بیرئەکاتەوە، خۆی شت بەدی‌دێنی. تەنانەت بیری، کەڵکەڵەی، جوانی و هونەرەکەی، بڕوای، داوەریەکانی مێژوویی و کۆمەڵایەتی خۆی، هەمووی ئەمانە بەهۆی خۆیەوە بەدی دێت، تا ئاویلکەی ماوە لە رێ‌ی پێشڕەوتی وڵاتەکەیا تێ‌ئەکۆشی و خەبات ئەکا. ئەمە گەل و کۆمەڵەکە بە هۆی تێ‌کۆشین و بیرکردنەوەیەوە بەسەربەخۆیی رامیاری و شارستانیەت و ژیار ئەگات.

لە بەر ئەوەی هیچ گەل و کۆمەڵێك بڕست و توانای بووژاندنەوەی ئابووری و پیشەسازی وڵاتەکەی نەبێ، کەڵەگایی سەرەتا دەرفەتی دەربڕینی بیر و کەڵکەڵە لە ئەو گەلە ئەستێنێ تا بە بیری چارەوە نەبن. وە لە بەر ئەوەی هیچ رەچەڵەك و بنەچەکێ لە بەرامبەری خۆرئاواوە نەگاتە سەربەخۆیی، خۆرئاوا پایەکانی بنەڕەتی مرۆیی و فەرهەنگی و زانیاری ئەو گەلە کە بە ئەو کە سایەتی سەبەخۆیی ئەدا ئاوەژوو ئەکا و بە شێوەیێکی پووچ دەری دێنێ، وە کەڵەگایی ئەو جۆرە گەلانە

نەبەگە و شل و ول ئەکاو پاشان ئـەیانڕازێنێتەوە، ئـەویش چ رازاننەوەیێ وەکوو گۆڕی گاور کە لە رواڵەت دا جوان و رازاوەیە، وە لە ناوەوە گردەنشـینی سـووچ و گونا و نافەرمانی‌یە.

مەولەوی لە بارەی ئەم جۆرە کەسـانەوە ئـەفـەرمێ ئـەوانە وەکوو گۆڕی گاورەکانن. گۆڕی خـواناس لە ناوەوە پڕ لە تیشـك و پریشکـە، وە لە دەرەوە ئاروختەیە. گۆڕی گاوریش تا حـەزکەی لە دەرەوە جـوان و رازاوەیە، وە بە بەردی بایی‌دار و بە نرخ دروسـت کراوە و کێلی زێڕینی لە سـەر دانراوە، وە لە ناوەوە گیرۆدەی ئەشکەنجە و قاری خوایی‌یە. خۆرئاوایش ئەو وڵاتانەی کە ئەیخـاتە ژێر چنگ لە رواڵەتا ئـەیانڕازێنێتەوە کە چـی لە ناوەوە چـروك و پووچ و بێ‌ناوەڕۆك و بێ‌بایەخە.

کەڵەگایی رەوشتێکی داناوە کە لەم رەوشتە دا پەیوەندی خۆرهەڵات و خـۆرئاوا لە شێوەی فەرهەنگی دا پیشان ئەدا، وە ئەو شێوە و رەوشتە ئـەمەیە: خـۆرئاوایی نابێ فەرهەنگ و مێژوو و کەسایەتی خۆرهەڵاتی لە ناو ببا، بەڵام ئەبێ کاری بکرێ کە ئەوان بۆیان دەرکەوێ کە فەرهەنگەکەی خۆیان بە دەردی ئیمڕۆ ناخـوا، وە بە چەشنێ فەرهەنگەکەیان پیشان بدرێ کە خـۆیان هەسـت کە ن رەگەزی دەسـتی دووهەمن و خۆرئاوایی رەگەزی دەستی یەکەمە. خـۆرئاوایی مێشکـی هەیە و بیر ئەکاتەوە و شت بەدی‌دێنێ، بەڵام خۆرهەڵاتی تەنیا ئـەبێ هۆنراو بهـۆنێتەوە و هەر لە بارەی خواناسی و دەرویشی‌یەوە بیر بکاتەوە. وە هەر لە بەر ئـەمەیە کە زۆربەی خۆرهەڵات ناسـەکان دەسـتنووسە ئـایینی‌یەکانیان لا گرنگـە و هەر کام لەو دەستنووسانە دە جار لە گەڵ پەراوێز و لێکۆڵینەوە و راڤە دا چاپ ئەکەن. کە چـی خۆمان لەم بارەوە کارێکمان نەکردووە و ئێسـتا حـەفتا لە سـەدی دەسـتنووسە زانستی‌یەکانی ئێمە هێشتا لە پەڕتووکخانەکان دا ماوە و خەریکە ئـەپورتکـێ و لە ناو ئەچێ و کەسیش بەدوویانا ناڕوا.

کەڵەگایی لە بەر ئـەوەی خـۆرهەڵاتی تێ‌گەیێنن کە تۆ تەنیا بە دەردی هۆنراو هۆنینەوە و ئەم جۆرە مەبەستانە ئەخۆی، وە ئەبێ پەیڕەوی لە خۆرئاواوە بکـەی تا ژیان بەیتە سەر ئەوەیە کە جیهانیان کردووەتە دوو بە شەوە: جیهانی ئـەنبووژەنی کە جیهانێکی گڵاو و چەپەڵە و پەیوەندی بە خـۆرئاواوە هەیە، وە جیهـانی بزۆنی و

واتایی و هەمیشـەیی و جـاویدانی و متافیزیك و ریشـۆنی خـوایی کە پەیوەندی بە خۆرهەڵاتەوە هەیە و هی خۆرهەڵاتی‌یەکانە.

بنەچەکی رەگەزایەتی کە لە سەدەی بیستەم دا بە دی هاتووە بیروڕاییکی تازە و نوێ نیە بەڵکوو بیرێکی کۆنی خـولی بت پەرسـتی و نەزانی‌یە. جـا ئـەم بیرە لە سەدەی بیستەم داچوّن بەدی هات ئەبێ‌لە بارەیەوە قسـە بکـەین. ئـەم بیرە بیر و ئەندێشـەی عەربەکانی بەر لە ئیسـلام بوو. هەر کە ئـایینی پیرۆزی ئیسـلام بەدی‌هات و پەرەی سەند ئەو بیرەش لە ناو چوو. ئەی چـوّن لە سـەدەی بیسـتەم دادیسـانەوە ئـەم بیرە پەیدا بووەوە؟ لەم بارەش ئـەبێ بڵێین: خـۆرهەڵاتێك کاتێ بزانێ کە ئەو لە رەگەزی دەسـت دووهەمە و بڕوای بەوە بێ کە خـۆرئاوایی‌یەکان رەگەزی دەست یەکەمن و فەرهەنگ ساز و پیشەسازن خۆ بە خـۆ پەیوەندی دایك و فەرزەن لە نێوانی ئـەوانابە دی دێ. چـونکە کەڵەگایی خـۆی بە شـاری دایك ئەزانێ و ئاسیایی‌یەکان و ئەفریقایی‌یەکانیش بە منالگەلێکی بێ‌شێواز و بێ‌فەهێت ئەزانێ و ئەبێ لە ئامێزی خۆیا ئەوان پەروەردەکا.

ئەمە رەوشتێکە کە لە مێژەوە هەیە. کاتێ دایك منالەکەی دەر ئەکا، منالەکە لە بەر ئەوەی ئاوەکی نەبێ و بکەوێتە دەستی لاوەکی ئەوەیە کە پەنا ئـەباتە ئـامێز و باوەشـی دایکـی. خـۆرهەڵاتیش بە هۆی پڕوپاگەندەی پووچ و چـرووکی خۆرئاوایی‌یەوە کاتێ هەستکا کە شتێکی لە دەست نایێ و مرۆیێکی گردەنشین و بێ‌بەهرەیە و هەموو شـتێکی هەر ئـایین و دێژە و وێژەیە، وە کاتێ هەسـت کا پەیوەندی بە نەژادێکەوەیە کە فەرهەنگـی، هونەری، هۆنراوی، مێژووی، پیاوانی مێژوویی و هەموو شتێکی پەستە و خۆیشی هیچ شتێکی لە دەست نایێ شەرمەزار ئەبێ و خۆی بە پەسـت ئـەزانێ، وە لە بەر ئـەوەی تانەی لێ‌نەدەن و سـەرکۆنەی نەکەن خۆی بە خۆرئاوا نزیك ئـەکاتەوە، وە بە رێ‌ورەوشـتی ئـەوان ژیان ئـەباتە سـەر تا بڵێ من پەیوەندم بە توّوە هەیە، بۆیە وەك ئـەو ئـەژی و وەك ئـەو ئەجوولێتەوە و ئەدای ئەو دەردێنێ و خۆی ئەنوێنێ و بە ئاکار و رەوشتی ئەو خۆی ئەڕازێنێتەوە و لاسایی ئەوان ئەکاتەوە و ئەکەوێتە دوویان و چاویان لێ ئـەکا و بە گومانی خۆی بەشتێ ئەگا.

خۆرئاوا ئێستا کە زۆربەی گەلەکانی خسـتووەتە ژێر چنگ و چـەپۆکی خـۆی و

ئەوانی چەساندووەتەوە، وە فەرهەنگ و هونەری ئەوانی تیا بردووە و وەکوو کۆیلە و دیلێکی ئاتاج و زەبوون و لاسایی‌کەری لێیان کردووە، ئەبێ چ بکرێ کە لە ژێر رکێفی ئەو رزگار بن؟. دروشمێ کە لە لایەن رۆشنبیرانەوە پازدە سال لەمە و بەر لە سەر ناو و نیشانی پاشین تاقی کردنەوەی فەرهەنگی دژی کەڵەگایی لە جیهـان دا دەربڕاوە گەرانەوەسەر خۆ و بیرکردنەوەیە. بەڵام گەڕانەوە بۆ سەرکام‌خۆ؟ ئـەوەی کە ئەمەسەزر ئەڵێ؟ یا منێ کە لە ئێران دا ئەژیم؟ چونکە گەرانەوەسەرخۆی ئـەو لەگەڵ گەڕانەوەسەرخـۆی من‌دا گەلێ توفیر و جیاوازی هەیە. کاتێ من لێرە دا بە ناوی خوێندکارێکی ئێرانی و ئەمەسەزر یا فـرانس فـانوون بە ناوی خـوێنکارێکی ئەفریقایی یا گەزیرەکانی ئانتیل ئەڵێین گەل ئەبێ بگەڕێتەوە بۆ سـەر خـۆ و بیری خۆی، وە وڵات و نیشتمانەکەی ئـازاد بکـا، لە رواڵەتا قسـەکانمان لە یەك جـوێ ئەبێتەوە، بەڵام لە بنەڕەتا ئامانجەکەمان یەك ئەگرنەوە.

بە پێی وتەی پاسپرس ئێمە هەرسێکمان لاسایی‌کەری فەرنگـەکان بووین و خوێندکاری فەرەنسە بووین، وە وەکوو یەك بیری نەتەوایەتیمان گۆڕا بوو. چونکە هەمووماو رۆیشتبووینە خۆرئاوا، وە هەر سێکمان لاسایی کەری خـۆرئاوا بووین. بەڵام ئێستا کە ئەمانەوێ بگەڕێینەوە سەر وێژە و فەرهەنگی خۆمان ئـەبێ لە یەك جوێ بینەوە، وە هەر کاممان ئەبێ بگەڕێینەوە زێد و مەڵبە ندەکەی خـۆمان. کە وا بوو هەرکام لە ئێمە لێرە دا کە ئەڵێین ئەگەڕێینەوە سەر خـۆی خـۆمان هەمووماو بەشدارین. جابگەڕێینەوە سەر کام خۆ، ئەمە مەسـەلەیێکـە کە لە ئێران دا باسـی لێوە نەکراوە.

رۆشنبیرانی ئەفریقایی کە باسیان لە گەڕانەوە سەر خۆ کردووە، باسـەکەیان لە گەڵ رۆشنبیرانی ئێرانی دا توفیری هەیە. چـونکە کەڵەگایی لە ئـەفـریقا دا فەرهەنگی جۆرێ‌تر ناسـاندووە، وە لەناو گەلەکانی ئیسـلام بە تایبەت لە ئێران دا کەوڵاتێکی شارستانیەتی خۆرهەڵاتە بە جۆرێ تر فەرهەنگیان ناساندووە.

ئەو مەبەسـتانەی کە رۆشـنبیرانی ئیمڕۆیی ئێمە لەم پازدە سـاڵەی دوایی‌یە دا دەریان بڕیوە دورست لە شوێنی قسەکانی ئەمەسەزر و فرانس فانوون و ئەم جـۆرە کەسانە رۆیشتوون، وە ئـەم رەوشـتـە دەردێکـی ئێمە دەوا ناکا، لەبەر ئـەوەی خۆرئاوایی لە گەڵ منی موسـڵمان و ئێرانی و خـۆرهەڵاتی دا جـۆرێ تر دواوە، وە

لەگەڵ ئەمەسەزری رەشی ئەفریقایی دا جۆرێ تر قسەی کردووە. ئەو بە رەگەزی رەش ئـەڵێ مێشکـی تۆ ناتوانێ شـارستانیەت بەدی‌بێنێ، چـونکە رەگەزەکان لە جیهان دا دوو جۆرن: فەرهەنگ‌ساز و بێ‌فەرهەنگ. بێ‌فەرهەنگ ئەبێ ببێتە فاڵا و کۆیلەی گەل و کۆمەڵی فەرهەنگ‌ساز. بەڵام بە ئێمە ناڵێ کە ئێوە فەرهەنگ سـاز نین زۆریش خۆلکمان ئەکا و رێزمان ئەگرێ و شووتی ئەداتە ژێر باخـەڵمانا کە لە شەرمەزاری دا ئەبینە چۆرێ ئاو.

خـۆرئاوایی‌یەکان هاتوون و تەمەنێك لە سـەر یەك یەکی بەردەنووسـراوەکانی ئێمە رەنجیان کێشاوە و ئـەو شـوێنەوارانەیان بۆمان دۆزیوەتەوە، وە باشترین و گرنگترین شوێنەوارکان و دەستنووسەکانی ئێمە لە لەندەن و پاریس داچـاپ و بڵاو بووەتەوە، وەبەناوی باشترین شوێنەواری فەرهەنگی جیهان ناساندوویانە. ئـاغای گیپ تەواوی سامانەکەی خۆی بۆ چاپی پەرتووکە دەستنووسەکانی ئێمە تەرخـان کردووە. ئەوان ئـەم کارە بە خێر ئـەزانن کە رابردووی ئێمە گەورە کەنەوە. بەس ئێمە پەست نەبووینە و خۆر ئـاوایی‌یەکان گەورەمان ئـەکەن و لە خـۆمان زیاتر بە رابردوومان بایەخ ئەدەن.

خۆرئاوایی ئـەم فێڵ و فـریوەی بەدی هێناوە کە بە رۆشـنبیری رەش پێـــت ئەڵێ: تۆ رابردووت نیە، وە هەموو دەم و خـولێ دیل و کۆیلەی عەرەب و میصـر و قبت بوویت ئێستاش ئەبێ دیلی فـەرەنگ بیت. بەس واتای گەڕانەوە سـەر خـۆ و بیرکردنەوە ئەبێتە چی؟. ئەو بە ئـەفـریقایی ئـەڵێ کە تۆ ژیارت نیە، بەڵام بە ئێمە ئەڵێ کە ژیارتان بووە. بە ئـەو ئـەڵێ کە ئێوە ناتوانن فـەرهەنگ‌سـاز بن، بەڵام بە ئێمە ئەڵێ: ئێوە فەرهەنگ و شارستانیەتان بەدی‌هێناوە. کە وا بوو بە ئـەفـریقایی ئەڵێ تۆ بێ‌فـەرهەنگـی، بەڵام بە ئێمە ئـەڵێ ئێوە تەنیا لە رابردوودا فـەرهەنگتان هەبووە. خـوزگە هەر لە کۆکا بە ئێمەشـیان ئـەوت کە لە رابردوودا ئـایین، بڕوا، ژیار، پەڕاو، زانست و وێژە و هیچ شتێکتان نەبووە تا ئێمە بۆ رەچەڵەك و بنەچەکی خۆمان ئەمانسەلماند کە هەموشـتێکمان هەبووە. ئـەوان ئـەم کارەیان نەکردووە. ئـەوەی کە لە بارەیەوە باس ئـــەکەم مەبەســـتم رابردوویێ نیە کە بە گۆڕسـتان سپێرراوە بە ڵکوو رابردوویێکە کە ئێستاش هەمانە. رابردوویێك کە کلاسیسمێکی زیندووە، وە ئێستاش هەستی پێ ئەکرێ و لە گەڵیا ئـەژین. هەر ئـەو رابردووەی

کە کەسایەتی فەرهەنگی ئێمە دروست ئەکا و پاڵی پێوە ئەدەین، بەڵێ هەر ئەو رابردووە کە خۆرئاواییەکان باسی لێوە ئەکەن. بە ئەمەسەزر ئەڵێ کە ئێوە هیچ شتێکتان نیە، وە بە ئێمە ئەڵێ کە هەموو شتێکتان هەیە. بەڵام فەرهەنگ و وێژەکەی خۆمم لێ‌ئەبیزێنێ تا راکەمە باوەش و ئامێزی ئەو. لاوێکی ئەفریقایی لەبەرچی ئێستالە رابردووی خۆی جارس و هەراسان نیە و لێی نەبێزیاوە چونکە رۆشنبیرێکی رەش‌پێست بە ئەفریقایی و رەش‌بوونی خۆی و هۆزکەی شانازی ئەکا. لەگەڵ ئەوەش دا ئەفریقایی را بردووییکی وایە نەبووە کە خۆی پێ بشەکێنێتەوە و شانازی پێوە بکا و خۆی پێ هەڵ کێشێ و دڵی نەیێشێ. بەڵام خوێندکارێکی ئێرانی لە بنەڕەتا لە ئێرانییەکان ناچێ و وەکوو موسڵمانێکی نکوولیگێڕ و بەڵێن‌دەرنیە. هەموو شتێکی بە تیتاڵی داناوە و گاڵتەی پێ ئەکا و خۆی ئەکاتە فەرەنگی.

جارێکیان پیاوێ لە ناوی فڕۆکە دا لە تەنیشتمەوە دانیشتبوو. رۆژنامەیێك کە لە دەستیا بوو داوام لێکرد پێم بدا. کاتێ قسەی لە گەڵما کرد دیم شێوەی قسەکردنی بە ئەندازەیێ فەرەنگییە کە ناتوانێ وەڵامم بداتەوە. لە دڵی خۆما وتم بێ‌گومان ئەوەندە لە دەرەوەی وڵات دا ماوەتەوە زمانی زگماکی لە بیر چووە و بۆیە وا ناتوانێ باش لە گەڵما بدوێ. بەڵام پاشان فەرەنگییێی شتێکی لە ئەو ویست کە نەیتوانی وەڵامی بداتەوە. تو خوا سەرنجی ئەم جۆرە کە سانە بدەن کە دووسێ ساڵ ئەڕۆنە ئوروپا و دێنەوە بێزیان لە زمان‌و وێژە و فەرهەنگەکەی خۆیان دێتەوە. دە پێم ناڵێن ئەم جۆرە کەسانە بە چ شانازێیك ئەڵێن کە زمانەکەمان لە بیر چووە. من بەم کەسانە ئەبێ بڵێم ئەی گێلگەل ئێوە کە ئەوەندە ئامادەیی‌تان زۆرە زمانێ کە لە ماوەی بیست و پێنج ساڵا فێری بوون و لە سێ ساڵا لە بیری ئەبەنەوە چۆن زمانی بێگانە لە سێ ساڵا فێرئەبن؟ ئەم خۆپیشاندان و خونواندنە لەبەر چیە؟ پێم ناڵێن ئێوە لەچی ئەترسن؟.

بە راستی ئەم جۆرە کەسانە لەچی ئەترسن؟ لە خۆیان؟ دیارە ئەم جۆرە کە سانە لە خۆیان بێزارن و لە هەموو شتێکیان بێزیان دێتەوە و بە رابردوو و ئێستای وڵاتەکەیان بایەخ نادەن و ئەبێ هەر سەریان رادەن. ئەم جۆرە کە سانە هێشتا خۆیان ناناسن و لایان وایە کەسانن. چونکە خۆیان باش نەناسیوە. ئەوە نازانم

لاوەکانمان بۆ ناگەڕێنەوە سەر خۆیان. لە بەرچی هەموو شتێکی وڵاتەکەیان لەبەر چاویان ناپەسەندە و لێیان بێزیاوە. ئەم رەچەڵەکە لەبەرچی هەموو کەسایەتی‌یەکانی فەرهەنگی و زانیاری و وێژەیی ئێمە تاوانبار ئەکا؟ رۆشنبیرێکی وەکوو ئەبووزەری غەفاری کە ئوروپایی‌یەکان ئەو بە یەکێ لە شۆڕشگێڕانی ئیسلام دائەنێن لەبەرچی رەچەڵەکی نوێ ئەو بە کۆنەپەرستی تاوانبار ئەکا. بەڵام ئەگەر یەکێ بێ و گۆرانی‌یەکانی «بلیتیس» کە ناوی سوزمانێیکی یوونانی بووە بە هۆنراو بیهۆنێتەوە و بلاوی کاتەوە، ئەو بە مرۆیێکی رۆشن بیر و پێشکەوتوو ئەزانن.

بنەچەکی جوانی رۆشبنیر کە نکوولگێڕە و ئیدئۆلۆژی و برۆوای‌هەیە و لەبارەی چارەنووسی گەل و کۆمەڵەوە بیر ئەکەنەوە، وە لە بەرابەری هەمووی چینەکانی گەلەوە بە رپرسیارن، لە بە رچی تەواوی ژیانیان بە هۆنینەوەی هۆنراوی نوێ و هۆنراوی کۆن و هونەر بۆ ئاغای یونسکۆ ژۆزنە دووکاسترۆ ئەبەنە سەر؟ ئەمانە خۆ وت و وێژی کۆمەڵایەتی نین کە رۆشنبیرانی ئێمە خۆیان پێوە خەریك ئەکەن، بە لکوو پیس‌ترین هیرۆیین و ژارێکە کە دیسانەوە ئەچێتە ناو خوێنی ئەم رەچەڵەکە. ئەم رەچەڵەکە کە نکوولگێڕە و خۆی بە بەرپرسیار و خاوەن پرسیار دائەنێ بۆچی خەریکی فرمێسك هەڵوەراندنە و کەوتووەتە شوێنی بکت؟ مەگەر رەچەڵەکی ئێمە ئاگای لەوە نیە کە ئەم رەوشتەیان لە سەدەی شەشەم و حەوتەم دا بەدی هێنا بۆ ئەوەی خوێنی خاوێنی گەلی ئەم وڵاتە ژەهراوی کەن.

رەچەڵەکی ئێمە کە خۆی بە رۆشبنیر و بەرپرسیار ئەزانێ و لە بارەی کۆسپەکانی گەلەوە ئەدوێ، ئەبێ ئەوەش بزانێ کە بکت پیاوێکی نامۆیە و لەگەڵ ئێمە دا پەیوەندێکی نیە. بەڵام ئەبووزەر کە پیاوێکی شۆڕشگێڕ و مرۆیێکی کۆمەڵ دۆستە و پەیوەندی بە ئێمەوە هەیە بۆ ئەبێ بێزمان لێ بێتەوە و ئەو لە دەست بەردەین‌و بکەوینە شوێنی بکت و برا بکت. وە ئەمەیە کە رابردووی ئێمەیان لە بەرچاومان بێزاندووە.

جارێکیان لە مەشهەد دا ئەنجومەنی هەرساندن و فێرکردنی ئایینی دامەزارا بوو، وە ئامۆژگارە ئایینی‌یەکان لە هەموو شارستانێکەوە هاتبوونە ئەوێ و داوایان لە من کرد کە لەم بارەوەقسەیان بۆ بکەم. من پیانم وت سەرەتا ناوی ئەو باسەی

که ئەمەویٚ لە سەری بدوم پێتان ئەڵێم ئـەگەر پەسـەندتان کرد ئـەوا لە بارەیەوە ئەدوم ئەگینا کە سمان لە کەس. وتیان ئەتەویٚ لە بارەی چیەوە باس بکەی؟ وتم پێشـنیارێکە بوٚ وەزارەتی فـەرهەنگ کە بەجـیٚهێنانی زوٚر سـادەیە و پسپوٚر و ئـاموٚژیاری ناویٚ و پێویسـتی بە پارە و دراو نیە و لە گەڵ ئـەوەش دا گەورەترین ئوودە و خزمەتە بە ئیسلام، وە پێشـنیارەکەش ئـەمەیە کە بەرنامەی هەرسـاندنی ئـایینی لە فێرگەکانی ئێران دا لابەن، وە لە جێگـەی ئـەو وانە دا وەرزش دانن. لەبەر ئـەوەی کاتیٚ ئـەو منداڵانە لەوانە و خـوێندنی سـەرەتایی و ناوەندی ببنەوە ئەتوانین پێیان بڵێین ئایین و دێژە بەم چەشنەیە، وە رێگە و رەوشـت و ریٚ و رچـە ئەمەیە. ئەویش لە قسەکان تیٚئەگەیی و وەریئـەگریٚ و لە دڵی خـوٚیارایئەگری. بە ڵام ئێستا لە بارەی ئایینەوە شتیٚ بوتریٚ چی تیٚئەگا؟.

من کاتیٚ لە کولژدوفرانس دا لە بارەی فەلسەفەی کوٚمەڵناسییەوە ئەدوام، لە پاش تەواو بوونی وتارەکەم ئەو کەسانەی کە لەویٚ دا دانیشتبوون لە منیان ویست کە دیسانەوقسەیان بوٚ بکـەم، وە بەم چـەشـنە کوٚبوونەوەکە تا دەم بەیانی درێژەی پیٚدرا. زانستگەیێکـی وەکوو کولژدوفـرانس کە من قسـەم تێدا ئـەکرد زوٚربەی مارکسـیستەکان ـ سـووسیالیستەکان ـ ئگـزیستانسیالیستەکان ـ کاتوٚلیکـەکان ـ دیندارەکان و بیٚدینەکان لە وتارەکەم تیٚگەیشـتن بەڵام قسـەکانم لە لای کوٚمەڵە ئایینییەکانی ئێران دابە پێچە وانەی ئـەوانە و هەر سـەری بوٚخـول ئـەدەن و هیچیٚتر. لە زانسـتگەی تارانیش دا باشـتر ئـەتوانم لە بارەی ئـایینەوە بدوم تا زانستگەی مەشهەد. جارێکیان لە زانستگەی سوربن‌دالەبارەی قارەمانی کەربەلاوە وت و یێم کرد و پێیانم راگەیاند کە بەم چەشنە لە بەرامبەری زوٚروستەمارا پەرێودو مەردانە کوژراوە و لە ناوی دڵی گەلی موسڵمانا نێژراوە، هەموو قسەکەمیان چـووە دڵەوە و چە پڵەیان بوٚم لیٚدا.

خوٚزگەئـوروپاییەکان هەر لە سـەرتاوە پێمانیان ئـەوت کە ئێوە فـەرهەنگ و وێژە و دێژە و ژیارتان نیە تا ئێمەش ئـەمانتوانی پەلەقـاژەیی بکـەین و بەشـتیٚ بگەین و رەچەڵەك و بنەچەکی خوٚمان بەرەولای ریٚ ورچەی خوٚمان بگـەرێنەوە و پێداویسـتییەکانی گەل و کوٚمەڵ بەجـی بێنین. بە ڵام هەنووکە کە ئـەمانەویٚ لەبارەی خوٚمانەوە بدوین بوٚنی بێزاری لە چاوەکان وهەستەکان‌وزەینەکاناهەڵئـەکا

و خێرا واز له ڕێوڕەوشتی خـۆمان دێنین و ئـەو هەموو کەلەپووری نەتەوایەتی‌یە بەجێ دێلین و ڕائەکەین و باوەش ئەکەینە درۆشمەکانی خۆرئاواوە.

ئەمەیە کە ئەمەسـەزربانگ‌لەگەلەکەی ئـەکا و پێیان ئـەڵێ بێن با بگـەڕینەوە سەر ڕێورچەی خۆمان. بەڵام منیش ئـەڵێم گە ڕانەوە بۆســەرکامخــۆ؟. ئــایا گە ڕانەوەبۆ سەر ئەو خۆیە کە ئورپایی یەکان لەناویان بردووە و شـتیـ‌تریان پێمان پیشان داوە؟ کەوایە گەڕانەوەمان زۆر سەخت و دژوار و نالەبارە.

ڕوژێکیان ڕۆیشتبوومە دیتنی پیاوێ کە خۆی زۆر بە نۆپەرداز ئـەزانی، لایشـی وابوو کە گەڕاوەتەوە سـەر خـۆی. لە وێدا جلی وڵاخێکــی نابووە بەردەم هۆدەی مێوانخـانەکە یەوە. وتم کاکی‌بەڕێز واتاو مانای گە ڕانەوە سـەر خــۆ ئــەمەیە؟ لەبەرچی جلی وڵاخێکت خسـووەتە بەردەم هۆدەکەت؟. ئـەم گەڕانەوە سـەر خـۆ، گەڕانەوە سە رخۆیێکی ئەمریکایی‌یە. لەڕوژێکەوە ئەوان هاتن وئەم جل و مووروە کە ڕانەیان کڕی و کردیانە ملی ژنەکانیان ئێمەش خۆمانمان دەرخست. سەرنجـی کەریەتی بدەن، کەریەتێکی‌نویێ.

کە وا بوو بگە ڕێینەوە سەر کامخـۆ؟ ئـایائێمەش خــۆمان نوقمی ئــوومانیسم بکەین؟. ئوومانیسم وئەنتەر ناســیۆنالیسم کە لەم خــول و چــە رخــە دا باویان سەندووە درۆیێك و فریوییێکە بۆ گەلەکان کە ئەیانەوێ کەسـایەتی فـەرهەنگـی و نەتەوایەتی ئێمە لە ناو ببەن. وە ئــەم درۆ و دەلەســەیان بۆ لە ناو بردنی وێژە و فـەرهەنگ و کەلەپووری نەتە وایەتی ئێمە پێك هێناوە. وە ئـەم فـریوەیان لە بەر ئەوە داهێناوە کە هەموو گەلەکانی جیهـان ڕێورچـەی خـۆیان لە دەسـت بدەن و ئەوسا ڕێورچـەی ئـەوان وەرگرن و ببنە یەك و یەك بگـرن. وە بە پیێ قسـەی فەرەنگی‌یەکان ئێمە کە گەلێکی دەست بەتاڵ و بیێماڵین، وە ئەوانیش دە وڵەمەند و ماڵداران ئەبێ ئێمە ببینە نۆ کەر و ئەوانیش ببنە ئاغا .بە قسەی ئەوان لەم جیهانە دا هەر خۆرئاوایی‌یێ مافی‌ژیانی هەیە و هەموو شـتێ پەیوەندی بە ئـەوەوە هەیە. سارتر ئـەڵێ :لە چـاوی کەڵەگایی‌یەوە لە جیهـان داتەنیا پێنجصە دمیلیون مرۆی شــارستانی و ژیارهەیە ،وە دوو ملیار و پێنجصــەد میلێونی‌تر بوومین . بە پیێ بڕوای کەڵەگایی تۆفیری مرۆ و بوومی وەکوو خۆرئاوایی و خـۆرهە ڵاتی یە. بەس ئەگەر خۆرهەڵاتی بیەوێ خۆی بکاتە ئومانیسم، کە سایەتی خۆی لە دەست ئـەداو

بە جاریٚ خۆی ئەتوێنێتە وە. بە پیِ ی قسەی ئەوان ئێمە بوومین وئـەوان مرۆ، وە هەموو جۆرە بە شدارێکی ئوومانیستی لەگەلٚ ئەوانا گزییێکە بە خۆمان .

جائەبیٚ وریا بین و گوڵی ئەوان نەخۆین و خۆمان لە ئاپۆری ئـەوان بپارێزین . چونکە پەیوەندی ئـەوان لەگەلٚ ئێمە دا وەکووپە یوەندی ئـاغا و نۆکەری‌یە . جـا ئەمە چ پەیوەندێکە؟. لە جیهان دا پەیوندی ئە و کە سـەی کە ئـەمژیٚ و ئـەو کە سەی کە ئەمژریٚ ،ئە و کەسەی کە شـت پیٚ ئــە گە یێنی و ئــەو کەســەی کە ئەیچوێنیٚ ، ئەو کە سەی کە قسە ئەکا ئەو کە سـەی کە گویٚ‌ی لیٚ ئـەگریٚ ، وە ئەو کەسەی کە ئە بیٚ بجوولیٚ و ئەو کە سـەی کە ئـەبیٚ لاسـایی ئــەو دە ربێنیٚ پەیوەندی دوو هێتمی خەنیم بەیەکە . کە وابووئەم چەشنە پەیوەندانە لە راستەقینە دا پەیوەند نیە و فریوە و بە ناوی پەیوەند ناسراوە . وە کوو پەیوەندەکانی برایەتی و نەتەوایەتی و ئەم جـۆرە درۆ و دەلەسـانە کە هەر لە ناوەکەی کەڵك وەر ئـەگرن، بەس ئەم چەشنە پەیوەندانە پەیوەند گەلێکی فریوکارانەیە کە ئـەیانەویٚ لە نێوانی دوو هێتمی دوژمن دا بە سوودی دەوڵەمەند و بە زیانی هەژار دایمەزرێنن ، وە ئـەم جۆرە پەیوەندانە پەیوەند نیە ئەبیٚ بڵێین دوژمنی‌یە . ئەمە روونە زالووێی کە خوێنی مرۆ ئەمژیٚ لەگەلٚ مرۆڤەکەدا ئەبێتە هاوخوێن ، بە ڵام ئەم هـاوخـوێنی‌یە دیارە هاوخوێنی نیە و دوژمنی یە.

کە وا بوو ئەم پەیوەندانە، پەیوندگەلێکی فریوکارانەیە کەکەڵەگایی ئـەیەویٚ لە ژێر ناوی رەگەز ، نەتەوە ، ئایین لە نێوانی دوو هێتمی جیهـانی ئـاغا و نۆکەری دا بەدی‌ی بێنیٚ . ئەو کەسەی وا خۆی بە مرۆ ئەزانیٚ و ئێمە بە بوومی ، وە خـۆی بە ژیر ئـەزانیٚ و ئێمە بە گێل. ئیدی چـۆن ئـەتوانیٚ پەیوەندی دۆسـتی و برایەتی لە گەڵمانا ببەستیٚ؟. نموونەی برتراندراسلە کە بە یەکیٚ‌لە ئـازادی خـوازانی جیهـان دێتە ژمار بزانین لەم بارەوە چــی ئــەڵیٚ . ئــەو لەم بارەوە ئــەڵیٚ: نەوت هی شـارستانیەتە ، هی فیسـار هۆز و فیســار نەتەوە و گەل‌نیە، هی ژیارە، هی پیشەسازی‌یە ، هی بەرەی مرۆیە. کورتەی قسـەکانی چیە؟ یانیٚ ئـەم نەوتە کە لە سەر زەویەکەی ئێوە داهە ڵئە قوڵی هی ئێوە نیە ، بە ڵکـوو هی ئـەو کە سـەیە کە بتوانیٚ نەوتەکە بچوێنێتەوە و بیکـاتە گەرووی ماشـین و فـرۆکە و تانگ و تۆپ و ئەم جۆرە شتانە و کە ڵکی لی‌وەرگریٚ . ئایا ئێوە کە خـاوەن نەوتەـن ئـەتوانن

بیچوێننەوە؟ نەخێر نا. بەس نەوت هی ئەو کەسەیە کە ئەیچوێنێتەوە . جا ئـەمە چ پەیوەندێکە کە لەگەڵ خۆرئاوادا ئەبێ بیبەستین و هەموو شـتێکمان بۆ ئـەو بێ و خۆمانیش کز و کڵۆڵ و دەست بە ئەژنۆ و قوڕ بە سەر دانیشین و بکـەوینە هەژاری و نۆکەریێ؟، ئەی بگەڕێینەوە سەر کام خـۆ؟ لێرە دام مەبەسـتم خـۆم و گەلەکەمە ئەبێ بگە ڕێمەوە سەر کام خۆ؟.

ئەگەر بگەڕێمەوە سەر خۆی باو و باپیر و بابکم ئـەوە تووشـم بووە بە تووشـی راسیسم و فـاشیسم و بت پەرسـتی و رەگەز پەرسـتی. وە ئــەم گەڕانەوەش گەڕانەوەیێکـی کۆنەپەرسـتی‌یە. من نامەوێ بڵێم کە هونەر تەنیا لە لای ئێرانی‌یەکان دایە و بەس، بەڵکوو ئەمەوێ بڵێم مێژووی وڵاتەکەم پیشانی داوە کە هونەرمەندم و هونەرم سرشت کردووە. ئەمەوێ بڵێم من مرۆییکی سـەربەسـت و سەر بەخـۆ و ئـازادم و لە مێژووش دا پیشـانم داوە کە بەدی‌هێنەری فـەرهەنگ و هونەر و وێژە و زانسـتم. بەس ئـەگەر گەڕانەوە بۆ ســەر رەگەز و بابك بێ، دیارە گەڕانەوە بۆ سەر راسیسم و فـاشیسم و نازیسـم و شـوینیسمە. گەڕانەوە بۆسـەر چەشنە ناسـیۆنالیسمێکی بوومی و کۆنەپەرسـتی‌یە. گەڕانە وە بۆسەر خـولی هۆزایەتی و عێلایەتی‌یە. ئێمە ئیتر نامانەوێ رەگەزپەرسـت بین و دیسـانەوە مرۆ بەرەو پەرستنی خاك و خوێن هان بدەین. صـەد و بیسـت و چـوار هەزار پێغـەمبەر هاتن و خۆیا بوون کە مرۆی سەرفراز و لاسـار بەرەو پەرسـتنی خـوای تاقـانە کە نوێنگەی جوانی‌یە هان دەن کە چی هەر گوێش نادا و ئێستا دیسانەوە ئەمانەوێ بە ناوی رۆشنبیر، داوا لە ئەو بکەین کـە خـاك و خـوێن بپەرسـتی؟، ئـەمە چ بانگێشتنێکە بۆ گەڕانەوە سەر خۆ.؟

ئێمە دەورێکی کۆنمان لە مێژوو دا هەیە. دەوری ماد ـ دەوری هەخـامەنشـی ـ دەوری ساسانی ـ دەوری ئەشکانی. ئایا دیسـانەوە ئـەبێ بگـەڕێینەوە سـەر رێ و رچەی ئەوان و لە سەر رێ و رەوشتی ئەوانەوە بڕۆین؟. خۆئەوانیش باو و باپیری ئێمەن و کارەکـانیان لە مێژوو دا تۆمار کراوە و ناوی هەموویان براوە، وە چەندین سەدەیە پەیوەندیان لەگەڵ ئێمە دا پچڕاوە، وە مێژوو نووسـان و کۆمەڵ ناسـان و زانایان و باستان ناسان ئـەتوانن چـۆنیەتی رێورەوشـتی ئــەوان بۆئێمە روون

کەنەوە و بیخوێننەوە، تا لێی تێگەیێن. بەڵام گەلی ئێمە بە قارەمانان و بلیمەتان و کەسایەتی‌یەکان و پیاوانی ئەفسانەیی ئەو خولانە شانازی ناکەن چونکە تورتان و مقەستی شارستانیەتی ئیسلامی هاتووە، وە لە نێوانی گەڕانەوە سەر خوی پێش ئیسلام و پاش ئیسلام دا ماوەی داناوە کە ڕێ و ڕەوشتی پێش ئیسلامی ئێمە تەنیا بە هوی زانایان و پسپوڕانەوە پیشان ئەدرێ، وە گەل و کومەڵی ئێمە هیچ شتێکی لەوانەوە لە بیر نیە.

گەل و کومەڵی ئێمە کە بەردە نووسراوەکان و شوێنەوارە مێژووەکان ئەبینن لایان وایە کە بە هوی جنوکەکانەوە نووسراوە و بە یادگار ماوەتەوە. دیارە هیچ پەیوەندێك لە نێوانی ئەوان و نووسەران و قارەمانی ئەو بەردانە دانابینرێ. بە کورتی بڵێم گەڕانەوە سەر خو، گەڕانەوە بو جل و کورتانی وڵاخ نیە، گەڕانەوە بو سەر کار و کردەوە و هوڵمانی کومەڵە کە وەکوو ماك وسەرچاوەییێکە کە ئەبێ بە هوی روشنبیرێکی بیر تێژەوە بسمێ و دەربێ تا بکەوێتە ناو ژیان و جووڵەوە. ئێمە ئەبێ بگەڕێینەوە سەر خوێك کە پەیوەندی بە هەست و مەبەست و ئایین و ژیان و یەکیەتی خومانەوە هەیە، وە ئەم خویەش ئێستا زیندووە و ئەجوولێتەوە و خوێکی کونەپەرستی نیە. بە راستی ئەو خویەکە لە سەرچاوەی گەل و کومەڵەوە هەڵ ئەقوڵێ خوێکی ئایینی‌یە؟ خوێکی ئیسلامی‌یە؟. وە ئەگەر بومان دەرکەوێ خوێکی ئایینی و ئیسلامی‌یە، ئەبێ بڵێین کام ئایین و کام ئیسلام؟.

هەر وەها ئەزانین فەرهەنگی ئێستای ئێمە لەگەڵ فەرهەنگی هەزار ساڵی لەمەو پێش جیاوازی و توفیرێکی نیە، وە ئەو زانستانە کە هەزار ساڵ لەمەو پێش وەکوو ئایین، ئەستێرە ناسی ـ وێژە ـ پزیشکی کە بە شێوەی زانیار ییکی گەورە لە جیهان دا خوی نواندووە تا لە بەرامبەر ئوروپایێك دا بتوانم بڵێم من مروێکم کە پەیوەندم بە فەرهەنگی گەورەی ئیسلامی یەوە هەیە ئێستاش باوە و لە ناو گەل دا بایەخی پێئەدرێ. جا ئەم پرسیارەش هەیە و ئەبێ بڵێین ئێمە بگەڕێینەوە سەر کام ئیسلام؟ ئایا ئەوەی ئێستا هەیە یا ئەوەی لە رابردوو دا هەبوە؟.

ئەگەر گەڕانەوە بو سەر رێ و رەوشتی ئێستا بێ خو ئەم رێ و رەوشتە وا ئێستا باوە لە گەڵ کونە پەرستی و مرو پەرستی و پەستی و مەستی و نەزانین دا ئاوێتە بووە، وە ئەم رێ و رەوشتەی ئێستا نە تەنیا ئادەمیزاد لە رێگە لا ئەدا بەڵکوو لە

ڕێی ژیانی ڕاستەقینەش ئەیخـاتە دواوە. هەر ئـەم ڕێ و ڕەوشـتی ئێسـتایە کە ناتوانێ گرێ کوێرەی تەنگ و چەڵمەکانی خەڵك بکاتەوە.

بەڵێ هەر ئـــەم ڕێ و ڕەوشـــتەی ئێســـتایە کە بیر کردنەوەومەبەســـتەکان و بڕواکانی بەر لە مەرگی گوێزاوەتەوە بۆ دوای مەرگ، وە کار و پەیوەندێکـــی لە گەڵ ئەم جیهانە دا نیە و هەموو کارێکی بۆ ڕۆژی پەسـڵانە و بیر لە کۆمەڵ و ژیان ناکاتەوە و هەر ئـــەم ڕێ و ڕەوشـــتەیە کە ڕۆشـــنبیرانی وەرەز و جـــاڕس و بێزار کردووەوە.

باسەکەم لە چەند وتەدا کورت ئـەکەمەوە و ئـەڵێم: ئێمە ئـەبێ هەموو هەویا و هیوائێکمان بە فەرهەنگی ئیسلامیمانەوە بێ و پاڵی پێوە بدەین و بگەڕێینەوە سەر ئەو فەرهەنگە و بیکەینە دروشمی خۆمان. ئەڵبەت مەبەستم ئیسـلامی پێشـووە، ئەو ئیسلامەی کە بووە هۆی ڕزگاری هەموو گەلەکانی چـەوساوەی ئەو خول و زەمانە کە تێدا ئەژیان. ئێمەش ئەبێ بگەڕێینەوە سەر فەرهەنگی ئیسلامی پێشوو. چونکە ئەمە تەنیا ڕێگائێکە کە ئەبێتەهۆی ڕزگاریمان و تەنیا فەرهەنگ و ژیارێکـە کە ئێسـتاش زیندووە، وە تەنیا بڕوائێکـە کە لە ناوی کومەڵی ئێســـتا دا باوە. ئیسلامی ڕاستەقینە ئەبێ هەر بناسرێ تا ئەوانەی وا لە بێ بڕواییش دا ئـەتلێنەوە بێنەوە ســـەر بڕوای پێشـوویان و لە ســـەرمایەی ئیســـلام کەڵك وەرگرن و پێی بحەسێنەوە تا لە سەر ڕێ و ڕەوشتی ئیسلامی ڕاستەقینە دا بڕۆن، بە ئەوانەش وا لایان وایە دینداری تەنیا بۆ توشەی ڕۆژی پەسڵانە، ئەبێ بڵیین و پیان بســەلمێنین کە ئیســـلام کۆمەڵ بەرەو ژیانێکـــی باش و ئـــابڕوومەندانە هان ئـــەدا و هەموو موسڵمانێك لە بەرامبەری ڕەچەڵەکی نوێ دابەرپرسیـارە و ئەبێ تێکۆشی تا خـۆی لە بەندی بێگانە ڕزگارکا و ئیسلام زیندوو بکاتەوە و ڕاپەڕینێ بەدیبێنێ.

ئەگەر لەڕێی ئیسلامی پێشوودا بڕۆین و بگەڕێینەوە سە ڕێ و ڕچەی پێشوو و بەرەو فەرهەنگی ئیسـلامی ڕاسـتەقینە هەنگـاو هەڵگـــرین، وە دیندار و بێدین و ڕۆشنبیر و چینەکانی تریش بگەڕێنەوە سەر ڕێورەوشتی ڕاستەقینەی خـۆیان و لە بەرامبەری کەڵەگایی و فەرهەنگی پووچی خۆرئاواوە ڕاوەستن و هەستن، وە گەل و کۆمەل بە هۆی ئایینەوە وریا کەنەوە و بیانخەنە جم و جووڵ و بزووتنەوە، ئـەوا گەل و کۆمەل لە کۆت و زنجیری کەڵەگایی ڕزگار ئەبێ و ئـەکەوێتە پەرە پێدانی

فەرهەنگ و ڕێ و ڕەوشتەکەی خۆی و وڵات و نیشتمانیش ئاوا ئەکاتەوە، لە لایێکی تریشەوە ئاگری خوایی لە ناو دڵی گەل و کۆمەڵ دا ئیشک و پریشک ئەداتەوە و هەتا هەتایە ئەو ئاگرە ناکوژێتەوە. ئەبێ بەهیوای ئەو ڕۆژە بین.

# فەرهەنگۆك

## «ئا»

**ئاپۆر:** ئاپۆرە، پەتەر، رووشە، ئاسیو (بلا)
**ئاستەم:** چەتوون، دژوار
**ئاکار:** رەوشت
**ئامێز:** باوەش، باوش
**ئـانارشیسم:** ئـارش لە یوونانی دا بە واتای دەوڵەتە، وە ئـانارشی یانێ بێ دەوڵەت و بێفەرمانڕەوا و بێڕێبەر. چـونکە ئـانارشیستـەکان لایان وایە هەر هێز و دەوڵەتێ کە لە وڵاتا دائەمەزرێ، ئـەبێتە هۆی بەدبەختی و رۆژە رەشـی گەل و کۆمەڵ، وە هەر لە بەر ئەمەیە کە ئەڵێن: وڵات پێویسـتی بە دامەزراندنی دەوڵەت نیە و خـەڵك خۆی ئەتوانێ بە شێوەی گرۆیی کار و باری ناو خۆیی خۆیان ئازادانە بەڕێوەبەرن. بلیمەتانی ئانارشیست بڕوایان لە سەر ئـەوەیە کە دەوڵەت ئـەبێتە هۆی دواکەوتنی گەل و کۆمەڵ، تەنانەت ئەبێتە هۆی بێکـاری خـەڵك و کەسـایەتیـیان پێشـێل ئەبێ. رێ و رەوشتی ئـانارشیسم یەکێ لە رێ و رەوشـتەکانی کۆنی یوونانە. هەر کە ئایینی مەسـیحی پەیدا بوو، ئـەم بڕوایەش لە ناوی فـەلەکانا پەرەی سـەند و پاشان لە ناوی پرۆتستانەکانیش دا برەوی پەیدا کرد. ئانارشیستەکان لە سـەدەی نۆزدەهەمی زاین دا بڕوایان هاتە سەر ئەوە کە ئەبێ کاربەدەسـتان و بەڕێوەبەرانی دەوڵەت رەشە کوژی بکرێن.
**ئاوەز:** ئاریش، ژیری (عقل)
**ئاوەژوو:** بەرواژی، چەواشە، هەڵگەڕاوە
**ئاوەکی:** ئاوارە، دەربەدەر
**ئاویلکە:** دواپشووی ژیان

**ئەنبووژەنی:** ماذی
**ئۆخژن:** هەستبە خۆشی کردن، ئارامی
**ئوومانیسم:** ئـەم ڕێبازە لە سـەدەی پانزدەهەمی زاین لە ئـورووپا دا بەدیهات. ئـامانجی بەدیهێنەرانی ئەم ڕێبازە ئەوە بووە کە پایە و پلەی مرۆڤایەتی بەرز کەنەوە.
**ئەنتەرناسیۆنالیسم:** ئەوانەی وا لە سەر ئەم ڕێبازەن، بڕوایان لە سەر ئـەوەیە کە هەموو وڵاتەکان و گەلەکان ئـەبێ بینە یەك و لە ژێر ئـاڵایێك دا بن و وەکوو یەك بژین، وەلایان وایە کە هێشـتا لە جیهـانا کۆمەڵگەلێکــی ڕەمەکی هەیە تەنانەت لە ژیانێکی ساویلکە بێ بەشـن. کە چـی گەلانی هەندێ لە وڵاتان لە پیشـەسـازی و کشت و کاڵ و ئـاوەدانی دا گەلێ پێشکـەوتنە، وە گەلێ لە گەلانیش لە جیهـانا لە هەموو شتێ بێوەرین.
**ئەیچوێنی:** بەختی ئەکا (صەرفی‌ئەکا)
**ئیدئۆلۆژی:** ڕێبازی رامیاری و کۆمەڵایەتی، ڕێ و ڕەوشتی کەموێی.
**ئیمپریالیزم:** بە لایەنگرانی دەوڵەتی ئیمپراتۆری ئـەڵێن کە تەنیا ئـامانجی گرتن و داگیر کردنی وڵاتان و کوشـــتن و تیا بردنی گەلەکانی جیهـــان و بەرگری کردن لە هەر جۆرە ئازادی و سەربەستی و سەربەخۆیی گەلانی‌تر.

«ب»

**بابك:** ڕەچەڵەك
**باکوور:** سەروو، ژووروو (شمال)
**بانگێشتن:** بانگ کردن
**بڕست:** توانا
**بژۆنی:** زەهلە، معنویات
**بنەچەك:** ڕەچە، ڕەچەلەك
**بیانی:** نامۆ، بێگانە
**بێشێواز:** بێفەهێت، بێئەدەب

«پ»

**پەرجۆ:** کارێکی هەڵکەوتووە کە لاسایی نەکرێتەوە، مۆجزە
**پەرتووك:** پەڕاو

«ت»

**تۆرتان:** قەیچی
**تووڵانەوە:** خراپە و فەساد

«ج - چ - خ»

**جارِس:** وەڕەز، هەراسان
**چرووك:** پووچ، بێنرخ
**خۆیا:** دیار، دەرکەوتوو
**خەنیم:** مێملْ، دژ (ضد)

«د»

**دڵاوا:** بەخشندە
**دێژە:** رێ و رچە و مەزهەب

«ر»

**راژە:** ئوودە، خزمەت
**راسیسم:** رەگەز پەرستی. لایەنگرانی ئەم رێبازە بڕوایان لە سەر رەگەز پەرستی و بەرتری رەگەزایەتی‌یە، وە لایان وایە کە رەگەزێکی تایبەت بە سەر هەمو رەگەزەکانی ترا بەرتری هەیە.
**راڤە:** شی کردنەوە
**رۆیالیسم:** ناوی رێبازێکە کە لە سەدەکانی ناوەڕاست لە ئوروپا دا بەدی هاتووە. ئەم دەستە کە لایەنگرانی رژێمی پادشایەتی بوون، هەموو دەم لە گەڵ ئازادی خوازان و کۆمار ویستانا بەربەکانی‌یان ئەکرد و گشت بزووتنەوە و راپەڕینێکیان سەرکوت ئەکرد.
**ریئۆنی:** کردەوەی دروست، حیکمەت

«ز - ژ»

**زالو:** زەروو
**ژیار:** شارستانیەت (تمدن)

## «س»

**سۆسیالیست:** بە لایەنگرانی سۆسیالیسم ئەڵێن کە بڕوایان لە سەر ئەوەیە هەموو کەسێك ئەبێ وەکوو یەك لە ژیان دا بە شدار بێ و لە کۆ کردنەوەی سامان و دارایی بەرگری بکرێ. ئەم بیرە رامیاری‌یە پێشینیە ێیکی کۆنی هەیە، وەکوو ئەڵێن ئەفلاتوون ئەم بیرەی بەدی‌هێناوە کە بڕوای لە سەر ئەوە بووە: سامان و دارایی پەیوەندی بە گشت کەسێکەوە هەیە، وە هەموو ئەبێ کەڵکی لێ‌وەرگرن. مەزدەکیش کە لە زەمانی قوبادی ساسانی «٤٨٨-٤٣١ ی زاین» دا ژیاوە هەر لە سەر ئەم رێبازە رۆیشتووە. پاشان مارکس بیر و بڕوای خۆی خستە سەر ئەم رێبازە و بە شێوەیی‌تر دەری‌هێنا.

## «ش»

**شووینیسم:** ئەم زاراوە لە ناوی نیکولاشوونەوە وەرگیرراوە، کە یەکێ لە هەڵنێران و پیاهەڵگوتانی ناپلئۆن بووە، وە وشەی شووینیست بە کەسانێ ئەوترێ کە کوێر کوێرانە ئەکەونە شوێن کەسێك و پیایا هەڵدەڵێن.

## «ف»

**فاشیسم:** ئەم وشە لە «فاشیسمۆ» وە سەرچاوەی گرتووە کە درۆشمی رۆمی‌یەکان بوو، وە ناوی بەستەیی بوو داگری چەند میلە و تەورێك کە لە بەردەمی گرۆکانی سپاکەیانەوە هەڵیان ئەگرت. پاشان مووسوولینی ئەم رێبازەی زیندوو کردەوە، وە گرۆیی لەسپاکەی کە بە ناوی کراس رەشان ناویان دەرکرد بوو، فاشیسمۆیان کرد بووە درۆشم و نیشانی خۆیان و ئەیاندا لە یەقەیان. ئامانجی فاشیستەکان ئەوە بوو کە هەمووی وڵاتانی جیهان بخەنە ژێر رکێف و جیهان بکەنە دەوڵەتێکی فاشیسم لە ژێر فەرمانی خۆیان. ئەم تیپە لە هەر کوێ سەریان پەیدا بوایی بازاڕی ئابووری‌یان کەساس ئەکرد و قڕە و کێشەیان ئەخستە نێوانی سەرمایەدارەکان و کرێکارانەوە، وە هەتا بۆیان بکرایێ ئایین‌یان کز ئەکرد و بۆ تیابردنی تیٔ‌ئەکۆشان.

## «ك»

**کۆك:** بنەڕەت، بناغە

**کۆیلە:** کۆلە، بەنی، بەندە.

**کەڵەگایی:** ئیستعمار
**گزی:** دڵڕەشی، بەدنمەکی (خیانت)
**گەزیرە:** لەن، جەزیرە

«ل»

**لاوەکی:** غەوارە، بێگانە
**لیبرالیسم:** لیبرالیستەکان لایان وایە کە لە بەرئەوەی مرۆ ئازاد و سەربەست هاتووەتە جیهانەوە و خاوەنی مگێز و دەسەڵاتە، ئەبێ تا ئەو رادەیە پێی ئەکرێ ئازادانە بژی. لیبرالیسم ئەبێتە دوو بەشەوە: یەکێ لیبرالیسمی رامیاری و ئەویتری لیبرالیسمی ئابووری. ئەم بیرە لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەم لە ئینگلستانا بەدیهات و رێبەرانی ئەم بیر و رێبازە بریتی بوون لە: جیمزمیل، جان استوارت میل و هەندێکیتر. بڕوای رامیاری لیبرالیستەکان بریتی بوو لە ئازادی بیر و بڕوا، ئازادی دوان و راوێژ کردن، ئازادی کار و فرمان تا ئەو جێگەی کە نەبێتە هۆی لە ناوچوونی ئازادی هەندێتر. هەر وەها لایان وابوو کە هەر کەسێ ئازادانە ئەبێ خەریکی بازرگانی و سەوداگەری بێ. وشەی لیبرالیسمی ئابووری بووە چەکێکی رامیاری و گرنگی دەرەبەگان و کەوتبووە زاری چینی سەرمایەدارەکان و بازرگانەکانەوە. چونکە لەو زەمانە دا لە ئینگلستان قرە و کێشە کەوتبووە نێوانی سەرمایەدارەکان و سەوداگەرانەوە. ئەم کارە سەرئەنجام بووە هۆی ئەوە کە سەودا و مامڵە بە شێوەیێکی بازرگانی گەورە دەربێ، بە جۆرێ کە خەڵك نەیانئەتوانی لە بەرامبەری ئەو بازرگانانە دا لە کاری سەوداگەری بەربەرەکانێ بکەن.

«م»

**ماك:** مادّە
**ماوە:** فاصلە
**متافیزیك:** زانیاری خوایی
**مێملێ:** خەنیم، دژ

«ن»

**نازیسم:** ئەم رێبازە رامیاری یە لە زەمانی هیتلر دا بەدیهاتووە. نازیەکان بڕوایان لە سەر بەرتری رەگەزایەتی و نەتەوایەتی بووە.

**ناسیۆنالیست:** بەو کەسانە ئەوترێ کە رەگەز پەرستن. پەیڕەوانی ئەم رێبازە کە ژمارەیان لە جیهـاندا کەم نیە، ئـامانجیان ئـەوەیە کە فـەرهەنگ و زمان و کەلەپووری نەتەوایەتی خۆیان ببووژێننەوە و لە سـەرری و رچـەی خـۆیان برۆن و نیشـتمانی باوك و باپیریان بپارێزن و ئەو سەرزەوی‌یانەش کە سـەرەتا بەشـێ لە وڵاتەکەیان بووە و ئێستا جیا بووە تەوە، بیگـەڕێننەوە سـەرخـاکی نیشـتمانەکەیان. بە پێی نووسراوە کۆنەکان سوقرات و ئەفلاتوون و ئـەرەسـتوویش لە سـەر ئـەم رێبازە رۆیشتوون.

**نامۆ:** بێگانە

**نکووڵگێڕ:** بە لێندەر (متعهد)

**نەبان:** ئەنگر، رووپەڕ، تۆراو

**نەبەگە:** شل‌وول

**نەیار:** دوژمن

«و»

**وشە:** وتە، واژە. (کلمە)

**وەڕەز:** جاڕس، وەڕەس.

**وێژە:** زانیاری. (ادب)

«هـ»

**هۆ:** بۆنە. (سبب)

**هۆدە:** ژوور، دیو، چاوك.

**هۆڵمان:** هێزی ژوورەوە، دڵهەڵگرتن. (وجدان)

**هەرساندن:** فێرکردن. (تعلیم)

**هەست:** پێزانین. (احساس)

**هەندێ:** برێ.

**هەنووکە:** ئێستاکە.

**هەویا:** هیوا، ئومید.

**هێتم:** دمغدغان. (قُطب)

«ی»

**یووگا:** ناوی قوتابخانەیێك و چەشنە وەرزشێکی هندی‌یە، کە بەهۆی هۆژاندن و مەشق کردنی ئەم وەرزشە تایبەتی‌یەوە، پاودانێکی رەوانی وەکوو کورتژم و ئاگایی، بۆ تێگەیشتن لە متافیزیك و ریئۆنی و زانیاری خوایی لە مرۆ دا دێتەدی.

## تازه‌ترین کتابهایی که سروش منتشر کرده است:

***ویژه‌نامهٔ «روز زن»***

***پیام امام و خط امام***

***راه حق:*** نوشتهٔ دمماپادا، ترجمهٔ رضا علوی

***وضع کنونی تفکر در ایران:*** نوشتهٔ رضا داوری

***لحظه‌های انقلاب:*** نوشتهٔ محمود گلابدره‌ای

***انجیر و زیتون:*** نوشتهٔ م. ا. فجر

***آخر شب:*** سرودهٔ محمود درویش، ترجمهٔ وسی اسوار

***عرفان و فلسفه:*** نوشتهٔ و. ب. استیس، ترجمهٔ بهاءالدین خرمشاهی

## سروش منتشر خواهد کرد:

***ناقدان یهودی صهیونیسم:*** نوشتهٔ موشه منوهین، ترجمهٔ وازریك درساهاکیان

***روابط اعراب و امریکا در خلیج فارس:*** نوشتهٔ امیل نخله، ترجمهٔ کارو

***موسیقی تربت‌جام:*** تحقیق محمدتقی مسعودیه

# سەرنج

## چاوەڕوانی ئەم پەڕاوانە بن:

***سیمای موحەممەد*** - نووسراوی: دوکتۆر شەریعەتی

وەرگێڕاوی: صدێق بۆرەکەیی

***دیل (بەندی)*** آیةالله طالقانی

وەرگێڕاوی: هۆشیار

***داهاتووی ئەم دینە*** - نووسراوی: سیدقطب:

وەرگێڕاوی: صدێق بۆرەکەیی

***بەرەو ڕێبازی سەرکەوتن*** - نووسراوی: بورهان ئەمینی

***دوبەیتی‌یەکانی بابەطاهری هەمەدانی*** - وەرگێڕاوی: صدێق بۆرەکەیی

